یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا
36
لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی سێیەم ئایاری - ٢٠١١

ستەم لە پڵنگ دڕندەترە!

جوانی ئافرەت وگومان و ئیرەیی هاوسەران!

لە سێیەمین ساڵیادی بڕیاردا

خۆشەویستان چاوەڕوانی چی دەکەن؟

دەتوانین یەکتریمان خۆشبوێت؟

فرمێسکە بە ئازارەکان

پلانسازی شار

The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بریار

مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

سالی سێیەم - ژمارە 36 - ئایاری 2011

**خاوەنی ئیمتیاز**

**ئەندازیار: مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی**

**سەرنووسەر**

**عادل محەممەد شێخانی**

sarnosar@bryarmagazine.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

**بەرزان ئەبوبەکر**

**دەستەی نووسەران**

هاژە شێروانی — پەری شێخ کەریم

بێگەرد فارس — محەممەد مێرگەیی

وەهاب حەسیب — ئەسکەندەر ڕەحیم

محمد هاشم محمد

**ڕاوێژکاری یاسایی**

**پارێزەر: ئازاد محێدین**

**بەشی هونەری و دیزاین**

**قەیدار ڕەحیم**

**بەشی ڕیکلام**

07480112787

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار

www.bryarmagazine.com




























**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

E-mail: bryar@bryarmagazine.com

دابەشکردن

کۆمپانیای پەیەر

٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠



هەرگیز
بێ هیوا
مەبن،
چونکە
بێ هیوایی
گەورەترین
بەڵایە
لە ژیاندا!
rasan group
ئەم لاپەڕەیە بە سپۆنسەری
گروپی کۆمپانیاکانی ڕەسەن بڵاو دەکرێتەوە




سەرنووسەر

# لە سێیەمین ساڵیادی بڕیاردا



بە دەرچوونی ژمارە (٣٦)، سێ ساڵ بەسەر دەرچوونی یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا تێدەپەڕێتو گۆڤاری بڕیار پێ دەنێتە ساڵی چوارەمی تەمەنی.

سێ ساڵ تەمەن هەرچەندە بە تەمەنێکی کورت هەژمار دەکرێت بۆ مێژووی گۆڤارێك، بەڵام لە دڵی خوێنەرانی بڕیاردا تەمەنێکی پڕ فەڕوبەرەکەتو عومرێکی درێژی پڕ سوودو کەڵکی بێ سنوورە.

سێ ساڵە بڕیار، لە گێژاوی سەردەمێکی ئاڵۆزو تەمتومانی بێ هیواییو ڕەشبینیدا، پەیامی بەرخودانو ڕابوونو هەڵسانەوەی هیوابەخشو ئیلهامبەخشی کردووەتە دیاری دەستی!

سێ ساڵە لە باوەشی گوڵزاری هەمیشەبەهاری وتەی جوانو پەیڤی ناسكو بەستەی پرسۆزو ئەوینو خۆشەویستیدا عاشقانی خۆی دەدوێنێو خەندەی بەختیاریو سەعادەتو ئاسوودەیی دەخاتە سەرلێوانیان.

سێ ساڵە، ڕێبوارانی ڕێگای پێشکەوتنو گەشەپێدانو سەربەرزیو سەرفرازی جووتیاری گوڵزاری بەهای جوانو ئاودێری دێراوی بیری وردو هزری بەرزو پاسەوانی بێداری ماندوونەناسی پاراستنی گەورەترین سەرمایەی وڵاتی کوردەوارین کە تاکی کوردەو لە پێناو بیناکردنو نۆژەنکردنو کاراکردنیدا بێ وچان کاردەکەن.

سێ ساڵە کۆمەڵێك سەربازی نەناسراو، پۆلێك پەپوولەی هەست سپیو دڵسپی بە وشەی ئاودامان وەك بەفرو بە وشەی ناسکتر لە پەڕەی گوڵاڵە، بە دەنگو ئاوازێ خۆشتربێ لە دەنگی بولبولو قاسپەی کەو، لە خوڕەی کانیاوی بە خوڕو ڕۆشناتر لە تریفەی مانگە شەو.

خۆشەویستان: هێندەی ئێوە شانازی بە بڕیارەوە دەکەن، بڕیار هەزار ئەوەندە دڵخۆشە کە لەم وڵاتەی ئێمەدا کەسانێك هەن بە گیرفانی خۆیان بە هەوڵو ماندووبوونو کاتی خۆیان، بێئەوەی چاوەڕوانی خەڵاتی کەس بکەن دڵسۆزیی بۆ گەلو وڵاتو نیشتمان، پێشتریش بە هیوای پاداشتی نەبڕاوەی کردگار، لە ژێر ساباتی پڕ میهرو ئەوینی بڕیاردا دەستیان لە دەستی یەکتری ناوەو بە یەك دەنگو بە یەك ڕەنگو بە یەك هەستو بە یەك دەست بۆ ئەم وڵاتە دەنووسن، نەخشە بۆ ئایندەی ڕۆشنی ئەم کوردستانە دادەنێن سروود بە باڵای کوردستاندا دەڵێن، بە پەنجەی نەرمیان برینی ئەم وڵاتە بریندارە سارێژ دەکەن.

لە ساڵیادی بڕیاردا دەستی یەکە بە یەکەی نووسەرانو هاوکارانو خۆشەویستانی ئەم گۆڤارە ئازیزە دەگووشمو لە خودای گەورە سەرکەوتنو پێشکەوتنتان بە ئاوات دەخوازم.

وێڕای سڵاوو دەستخۆشیو پێزانینی بێ پایانم بۆ بەڕێز ئەندازیار (مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی) کە شەرەفی خاوەن ئیمتیازی یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە مێژووی کوردستاندا بۆ خۆی هەڵبژاردو تا ئێستاش ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەم گۆڤارەی گرتۆتە ئەستۆی خۆی، لە کاتێکدا بە داخەوە هیچ کەسێك ئامادە نەبوو کە بێبەرامبەر یارمەتی ئەم پرۆژە نیشتمانییە گەورەیە بدات، کە پرۆژەیەکی کوردانەی نیشتمانپەروەرانەی بێ لایەنو سەربەخۆیەو شایانی ئەوەیە هەموو کوردێك شانازی پێوە بکات و خۆی بە خاوەنی ئەم پرۆژە نیشتمانییە بزانێت.

بوونی مرۆڤێکی وەکو بەڕێزیشیان هیوای ئەوەمان پێدەبەخشێت کە سوپاس بۆ خودا کەسانێك لە نێو ئێمەدا ماون ئامادەی بەخشینو قوربانیدانن لە پێناو گەلو نیشتمانی خۆیانداو بێئەوەی منەت بەسەر کەسدا بکەنو چاوەڕوانی سوپاسو پێزانین بن.

شکۆداربێت ساڵیادی دەرچوونی یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی لە کوردستاندا، سەرکەوتوو بێت کاروانی پێشکەوتنو داهێنان.

# کارگێڕی بە گوفتار

مرۆڤ هەڵەیەکی گەورە دەکات،
کاتێك ڕازی نابێت هەڵەکانی ڕاست بکاتەوە!

پەندێکی چینی

بەڕێوەبردنی باش، لە سەروەتو سامان باشترە.

پەندێکی پورتوگالی

ئەگەر زۆر خەواڵوو بوویت، ئەوا سەرینی قەرزارێك بخوازە.

پەندێکی ئیسپانی

خوای گەورە شیفامان دەدات،
بەڵام دکتۆر کرێکەی وەردەگرێت!

پەندێکی ئەڵمانی

دایك ببینەو کەنیشك بخوازە!

پەندێکی کوردی

پاشایەکی باش،
باشترە لە یاسای پڕدادوەری!

پەندێکی دانیمارکی

## کارگێڕی بە چیرۆک









# ستەم لە پڵنگ دڕندەترە!

لــە یەکێك لــە گەشــتەکانیدا کاتێك (کۆنفۆشــیۆس) بــە لای چیای (مــارا)دا تێدەپــەڕی، چــاوی بە ئافرەتێــك کەوت لــە بەرامبــەر گۆڕێــك دانیشــتووەو بە پەژارەیەکی زۆرەوە هۆن هۆن فرمێسك لە چاوانی دێنەخوار..

(کۆنفۆشــیۆس) لــە ئافرەتەکــە چووە پێشــەوەو لێی پرســی: بە بیستنی گریانەکەت، هەست دەکەم خەمێکی قووڵ لە ناختدایەو لە ڕووخسارتدا پەژارەیەکی زۆر بەدی دەکرێت؟

ئافرەتەکــە لــە وەڵامدا گوتــی: بەڵێ ڕاســت دەکەیــت، چونکــە پڵنــگ باوکی هاوســەرەکەی کوشــتەو هەنجن هەنجنی کرد، دواتر هاوسەرەکەشــم تووشی هەمان چارەنووس بوو، ئەمەش گۆڕی کوڕەکەمە کە لەم دواییەدا پڵنگێك کردی بە نێچیری خۆی.

کاتێك (کۆنفۆشــیۆس) گوێبیستی ئەم وەڵامــە بوو، لێی پرســی: ئەی بۆچی ئەم شــوێنە بەجێناهێڵیتو لێــرە ناڕۆیت؟ لە کاتێکدا هەســت بــەم هەڕەشــە گەورەیە دەکەیت؟

ئافرەتەکــە گوتــی: لەبەرئــەوە لێرە نــاڕۆم، چونکە ئێرە دەســەڵاتێکی ملهوڕو ســتەمکاری لێ نییە، بۆیە هەر ئێرەم پێ خۆشترە!

لێــرەدا (کۆنفۆشــیۆس) ڕووی کــردە قوتابییەکانــیو پێــی گوتــن: کوڕینە لە یادتان بێت کە ستەمو زۆرداری لە پڵنگیش دڕندەترە!

**لەم چیرۆکەوە فێردەبین:**

١- مــردن بە ئازادی زۆرخۆشــترە لە ژیان بە کۆیلەییو ژێردەستەیی.

٢- هەڕەشــەی ستەمو زۆرداری لەسەر گــەلان گەورەتــرە لە هەڕەشــەی هەموو دڕندەیەك.

٣- دڕندانەترین جانەوەر دەسەڵاتداری دیکتاتــۆری خوێنڕێژو بێ بەزەییە، کە لە ژێر دەســەڵاتیدا ژیانی مرۆڤەکان دەبێتە دۆزەخ.

٤- ئەو ئافرەتەی کە بە بەرچاوییەوە هەمــوو ئەندامانــی خێزانەکــەی بوونە قوربانی دڕندەیەك، بەڵام هێشتا هەر ئەو زێــدو نیشــتمانەی خۆشــتر دەوێتو دڵی نایەت جێــی بهێڵێت، چونکە هەســت بە ئارامی دەکات تێیدا.

٥- گەورەترین سیمای وڵاتی شارستانیو خاوەن ژیار دادوەرییە، هاوکات گەورەترین ســیمای وڵاتــی کۆنەپەرســتو دواکەوتوو زوڵمو ستەمو زۆرداریو نادادوەرییە.

٦- گەورەتریــن خەڵاتی حکومەتەکان بــۆ گەلەکانیــان ئــازادیو سەربەســتیو دادوەریو یەکسانییە.

٧- هەمــوو مرۆڤــەکان کەســانی دادوەرییان خۆشدەوێتو هیچ کەسێك نییە ڕقی لــە مرۆڤی دادوەرو خــاوەن ویژدان بێت، با لە بیروبۆچوونیشــدا جیاواز بن، هیچ کەســێکیش نییە لە ناخەوە مرۆڤی ملهوڕو زاڵمی خۆشبووێت، با بەڕووکەشیش پێچەوانەکەی دەرببڕێت.

٨- خودای گەورە ستەمی لەسەر خۆشی حەرام کــردووەو فەرمان بــە بەندەکانی دەکات هەرگیز ســتەم مەکــەن، (یا عبادی إنی حرمت الظلم علی نفسی فلا تظلموا).

٩- پێغەمبەری نازداریش دەفەرمووێت: ستەم تاریکستانی ڕۆژی دواییەو لە نێوان نزای ســتەملێکراوو خوداوەندیشــدا هیچ پەردەیــەك نییــە. (الظلــم ظلمــات یوم القیامــە، واتــق دعوە المظلــوم فإن لیس بینها وبین الله حجاب).

١٠- ئیبــنو تەیمیــەش دەڵێت: خودا دەوڵەتــی دادوەر ســەرکوتوو دەکات، بــا کافریش بێــت، بەڵام دەوڵەتی ســتەمکار دەڕوخێنێت، با مووسوڵمانیش بێت.

ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر



بەشی نۆیەم

# سەرکردایەتی

## بەڕێوەبەر:

شەشەم: جیاوازی نێوان بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو:

ڕەنگە بەڕێوەبەری زۆر هەبن لە دامودەزگاو کۆمپانیاکانی دونیادا، کە نەك فەرمانبەرەکانی، بەڵکو هاونیشتیمانییەکانیش شانازی پێوە دەکەنو هەمیشە وەك کەسێکی نموونەیی سەیر دەکرێن، بەڵام دیارە لەگەڵ بوونی ژمارەیەکی زۆر لە بەڕێوەبەری سەرکەوتووی، بەڕێوەبەر شکستخواردو سەرنەکەوتووشمان زۆرە، کە بەردەوام جێگای بێزاری خەڵکو فەرمانبەرەکانیانن لەبەر شێوەی ئەو جیاوازییەی خوارەوە کە باسمان کردووە لە نێوان بەڕێوەبەری سەرکەوتوو، سەرنەکەوتوودا:

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: مامەڵە لەگەڵ کارمەندەکانی دەکات، وەکو ئەوەی کە ئەوان مرۆڤن.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: مامەڵە لەگەڵ کارمەندەکانی دەکات، وەکو ئەوەی کە ئەوان تەنها ئامرازن.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: ئەو کەسانەی دەوێت کە پێشنیاردەکەنو بەردەوام پێش دەکەون.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: ئەو کەسانەی دەوێت کە ملکەچی فەرمانن و هیچ قسەیەك ناکەن.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: گرنگی بەڕاو و بۆچوونت دەدات، سەبارەت بە کارەکەی.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: گرنگی بەڕاو و بۆچوونت دەدات سەبارەت بەخودی خۆی.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: گوێت بۆ دەگرێت.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: فەرمانت پێدەکات.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: دەزانێت کە نازناوی (بەڕێوەبەر) ئەرکەکانی قورستر دەکات.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: وادەزانێت کە نازناوی (بەڕێوەبەر) لە هەموو ئەرکێك ئازادی دەکات.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: خۆی بە برا بچووکی هەموو کارمەندەکانی دەزانێت.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: هەموو کارمەندەکانی بە خزمەتکاری خۆی دەزانێت.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: بە پێی باری دەروونی خۆت، مامەڵەت لەگەڵدا دەکات.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: بە پێی باری دەرونیو میزاجی خۆی مامەڵەت لەگەڵدا دەکات.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: هەرگیز پلەوپایەی بەکارناهێنێت بۆ تۆڵەسەندنەوە.

*بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: دەسەڵاتەکەی تەنها بۆ تۆڵە سەندنەوەو پلەوپایەکەیەتی.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: بە پێی تواناکانت، ئاراستەت دەکات.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: بەپێی ئارەزوی خۆی، ئاراستەت دەکات.

* بەڕێوەبەری سەرکەوتوو: چاودێریت دەکات.

* بەڕێوەبەری سەرنەکەوتوو: سیخوڕیت بە سەرەوە دەکات.

حەوتەم: جیاوازی نێوان بەڕێوەبەرو سەرکردە:

«لە ناو دامودەزگاکانی دەوڵەت بە شێوەی فەرمی بڕیاری دامەزراندنی کەسێك دەردەچێت، وەك بەڕێوەبەر»، بەڵام لە ڕێکخراوو کۆمپانیاکاندا بە ئارەزوو ویستێکی ئازادانە کەسێك دەکرێت بەسەرکردە، بۆئەوەی ببێتە کارێزمای ئەو دەزگایە لە هەڵوێستو بڕیارەکان، دیارە ئەگەر بە وردی سەیری ئەو پرۆسەیە بکەین، بێگومان جیاوازییەکی گەورە بە دی دەکەین، ئەمە جیا لەوەی زاناو شارەزایانی بەڕێوەبەردنیش بەردەوام لێکۆڵینەوە دەکەن بۆ ئەوەی خاڵی جیاوازترو نوێ تر بدۆزنەوە لە نێوان ئەو پۆستەدا لە ڕووی دەسەڵاتو بڕیارەکان.

* بەڕێوەبەر: ئەو کارە ڕادەپەڕێنێت کە پێی سپێردراوە.

* سەرکردە: لە هەر کارێکدا کە ڕایدەپەڕێنێت داهێنان دەکات.

* بەڕێوەبەر: کاردەکات بۆ بەردەوامبوونی ڕەوتی کارەکە، بە پشتبەستن بە توانایی و پلەی وەزیفی، گروپەکەی بەڕێوە دەبات.

* سەرکردە: بەردەوام گەشە بە کارەکەی دەداتو بەدوای ئەو شتانەدا دەگەڕێت کە بۆ کارەکەی سوودبەخشن.

* بەڕێوەبەر: بەشێوەیەکی ڕاست ئەرکو پێویستییەکانی سەرشانی جێبەجێ دەکات.

* سەرکردە: لە بەڕێوەبردنی گروپەکەیدا پشت بە تواناو متمانەی خۆی دەبەستێت.

* بەڕێوەبەر:هەوڵدەدات کارەکان ڕێکبخاتو دووریان بخاتەوە لە شتە ترسناکەکان.

* سەرکردە: هەموو کارێکی ڕاست دەکات.

* بەڕێوەبەر: بە زۆری بڕیارەکانی لەسەر بنەمای عەقڵە، نەك سۆز.

* سەرکردە: بڕیارەکانی لە یەك کاتدا لەسەر بنەمای عەقڵو سۆزە.

* بەڕێوەبەر: بەڕێوەبەر گوێ لە خەڵك دەگرێت.

* سەرکردە: سەرکردە سەرنجی خەڵك ڕادەکێشێت.

* بەڕێوەبەر: بەڕێوەبەر سەیری نزیك دەکات.

* سەرکردە: سەرکردە سەیری دوور دەکات.

* بەڕێوەبەر: بەڕێوەبەر دەپرسێت چۆن؟ کەی؟

* سەرکردە: سەرکردە دەپرسێت چی؟ چۆن؟

* بەڕێوەبەر: پارێزگاری لە ئامانجەکان دەکات هەروەکو خۆیان هەن.

* سەرکردە: ئامانجەکانی پێش دەخات.

* بەڕێوەبەر: کاریگەری هەیە لەسەر ئەو کەسانەی لە ژێردەستیدان.

* سەرکردە: کاریگەری هەیە لەسەر ئەو کەسانەی سنووری خۆیان دەبەزێنن.

چۆمان ئەحمەد




# چۆن فەیسبووك بناسین؟

لە ڕوانگەی زانستی کۆمەڵناسییەوە ئینتەرنێت بەشداریکردنی مرۆڤە لە دەستکەوتنی زانیاریو ئەنجامدانی کارلێکە کۆمەڵایەتییەکان بێئەوەی فیزیکییەن بەریەککەوتن هەبێت، لە نێوان وەرگرو نێرەردا، بەبێ ڕەچاوکردنی شوێنگەی جوگرافی، هەڵبەت ئەم تۆڕە نوێیەی دەیەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم شڵەقانێکی لە ژیانی مرۆڤایەتیدا هێنایە بوون، بە تایبەتی تر فەیسبووك لەم دەیەی دواییدا فۆڕمێکی جیاوازتری دا بە پەیوەندییەکۆمەڵایەتییەکانو ئەو شێوازە ژیانە سروشتییەی مرۆڤایەتی لەسەری دەڕۆی بەڕێوە، هەروەك سەرجەم دیاردەکۆمەڵایەتییەکانی تری کۆمەڵگا لە هەبوونی لایەنی پۆزەتیڤو نێگەتیف بەدەر نەبوو، بۆئەوەی فەیسبووك بە باشی بناسین دەبێت لەسەر گرنگترین ئەو خاڵانە هەڵوێستەیەك بکەین، کە ئەم ماڵپەڕە هێناویەتیە بوون کە پاشان شیکاریی زانستیانەو بابەتیانەی بۆ دەکەین:

**لایەنە پۆزەتیفەکانی فەیسبووك:**

١- پێگەیەکی جیهانییەو لە هەموو شوێنێکی جیهاندا هەیە، بە هەموو شێوازەکان زانیاریت دەداتێ (نوسراو، وێنە، دەنگ، ڤیدیۆ)، هەموو مرۆڤێك بە جیاوازی ئاستی پسپۆڕیو پلەی ڕۆشنبیرییەوە دەتوانێت سوودمەندبێت لە فەیسبووك، ئەوە جگە لەوەی ناوەندێکە بۆ گفتووگۆو دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی.

٢- هۆکارێکە بۆ بانگەشەی هەر شێوازێك لە ئایدۆلۆژیاو بیروباوەڕی ئاینیو کۆمەڵایەتیو دەروونیو سیاسیو ڕۆشنبیری، واتا مرۆڤ دەتوانێت زۆر بە ئاسانی ئاڵوگۆڕی زانیارییەکانی بکاتو ئەوەی دەیەوێت بیگەیەنێت بە هاوڕێو دۆستانو تەنانەت کەسانێکی نەناسراویش کە ئەو ناتوانێت پێیان بگات.

٣- ئاگادار بوون لە ڕەوشی ژیانی هاوڕێیانو دۆستانو هەرکەسو نووسەرو ڕۆشنبیرو هونەرمەندێك گەر مرۆڤ بیەوێت.

٤- لە ئێستای جیهاندا لە ڕوانگەی ئابوورییەوە فەیسبووك سوودی لێوەردەگیرێتو وەك پێگەیەك بەکاردەهێنرێت.

**لایەنە نێگەتیفەکانی فەیسبووك:**

١- بە هەدەردانی کاتێکی زۆر لە ژیانی مرۆڤدا، هەڵبەت ئەمە یەکێکە لە گرفتە دیارەکانی بەکارهێنانی فەیسبووك بە تایبەت لە ژیانی گەنجاندا کە چەندین کاردانەوەی نێگەتیف لە بواری کۆمەڵایەتیو دەروونی بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

٢- زیانی هەیە بۆ هەرزەکارو تازە پێگەیشتووان لەبەرئەوەی لە ڕوانگەی فسیۆلۆجیو جەستەییەوە غەریزەی سێکسی زاڵە بەسەریاندا، ئەمەش زۆر کات وادەکات بە شێوازێکی نێگەتیف کەڵکی لێوەربگیرێت، بە دوای تێربوونی ئارەزووەکانیاندا بگەڕێن، کە دواتر فاکتەرێکە بۆ دوورکەوتنەوەیان لە کۆششکردن لە وانەکانیاندا.

٣- کردنەوەو پەیوەندی بەستن لەگەڵ ژمارەیەك پەیجو کەسایەتی دیارو نادیار کە لە ڕوانگەی ئاینیو چەمکی ئاکارەوە دروست نییەو ناباشە، ئەمەش کاریگەرییەکی نێگەتیفی دەبێت بۆسەر کەسایەتیو ڕەفتاری تاكو دروستکردنی لادانو کێشەی ناپاکی هاوسەری بە شێوازێك ٢٠٪ کۆی لێکجیابوونەوەکان لە ئەمریکادا دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆڵی فەیسبووكو ناپاکی هاوسەرگیری لەو ڕێگایەوە.

٤- کەمکردنەوەی پەیوەندیو کارلێکە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگای ئالوودەبوونی تاك بە فەیسبووکەوە، ئەم گرفتە لە ئێستای کۆمەڵگادا بووەتە هۆکاری داڕنینی تاك لە چواردەورو خێزانو هاوڕێیانی.

٥- بڵاوبوونەوەی فێڵ و درۆو نەمانی متمانە هاوتا لەگەڵ خۆشەویستییەکی وەهمیو ناڕاست لەبەرئەوەی دەتوانرێت بەناووناونیشانو وێنەی ناڕاستەقینەوە مرۆڤەکان خۆیان بناسێنن کە ئەمەش دەبێتە هۆکارێك بۆ فێلکردنو ناڕاستگۆیی.

٦- لە ڕوانگەی دەرونییەوە فاکتەرێکە بۆ هەستکردن بە گۆشەگیریو دڵەڕاوکێو خەمو نائارامی، هەروەك سەرۆکی کۆمەڵەی جیهانی پزیشکی دەرونی مامۆستا (زین) دەڵێت: هۆکارێکە بۆ دروستبوونی دڵەڕاوکێو خەمۆکیو پەشێوی دەروونی.

لێرەدا دەتوانین بڵێین فەیس بووك وەك هەر داهێنراوێکی سەردەم لایەنی پۆزەتیف و نێگەتیفی گرتووەتە خۆی، بەڵام ئایا تاچەند مرۆڤەکان لە ئێستادا توانیویانە ئەم داهێنراوە بە ڕووکارە باشەکەیدا بەکارببەن؟ ئەو چەند خاڵەی سەرەوە نەخشەڕێگای بەکارهێنانی فەیسبووکە لە بەردەم هەر تاکێکدا، پێویستە بەوپەڕی بەرپرسیارییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین، چونکە بە بێ ڕۆشنبیری تاك ڕاستەوخۆ وەرگرتنی ئەم پێگەیەو مامەڵەکردن لەگەڵیدا، وادەکات بەرەو فەنابوونو زەرەروزیانێکی زۆرمان بەرێت.



# چەمکی پلانسازی، شار

بەشی یەکەم

## چەمکی پلانسازی:

پرسیارکردن لە سەردەمە جیاوازەکانداو لە نێوان کەسایەتییە جیاوازەکاندا، سەبارەت بە پلانسازیو مەبەستی پلانسازی تا ئێستاش، ڕووبەڕووی چەندەها وەڵامی جیاواز بووەتەوە، ئەمەش مانای پێکنەهاتنە لە نێوان توێژەرانو خوێنەران لەسەر پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ چەمکی پلانسازی، هەرچەندە شێوە کۆدەنگییەکیش هەبێت لەسەر ناوەڕۆکی ئەم چەمکە لە ئاستو قۆناغە جیاوازەکانیدا، لەگەڵ جیاوازی ئەو لایەنانەی کە باسی ئەم چەمکەیان کردووە.

مرۆڤ چۆن پلان دادەنێت؟ ئەم پرسیارە ڕووبەڕووی تاکەکانو گروپەکانو کۆمپانیاکانو هەروەها حکومەتەکان دەبێتەوە.

پرۆسەی پلاندانان بەشێوەیەکی گەورەو دیار لە بڕیارەکانی تاکە پیشەییەکاندا دەردەکەوێت، هەروەها لە داهاتی خێزانو خشتەی بەرهەمی کۆمپانیاکانو پرۆگرامو سیاسەتیوزەوژینگە،بەرگریوخزمەتگوزاریە مرۆییەکانو ..هتد، دەردەکەوێت.

- پلانسازی هونەرو زانستو بەرنامەیە، هەروەها چالاکییەکی فرە لایەنەیەو هەوڵ دەدات بە بەردەوامی بۆ دەستەبەرکردنی تەواوی لایەنە جیاوازەکان.

- پلانسازی پرۆسەیەکە، تەنها بە کەسێك ناکرێت، بەڵکو بە گروپ (کۆمەڵ) ئەنجام دەدرێت، هەروەها هەموو تاکێك لە ناو کۆمەڵێك پلانسازدا ڕۆڵێکی هەیە کە ناتوانیت لەبەرچاوی نەگریت، لە هەمان کاتدا هیچ پلانسازێك لە بواری پلانسازیدا بە تەنهاو بێ بەشداریو هاریکاری پلانسازەکانی تر ناتوانێت ڕۆڵێکی سەرکەوتوو ببینێت لە قۆناغەکانی پرۆسە پلانسازییە جیاوازەکاندا.

- (د. ئازاد حەمە ئەحمەد شێخانی) بەم شێوەیە پلانسازی ناساند: پلاندانان لە پێناو گەشەپێدانی ئابوریو کۆمەڵایەتیدا: (پلاندانان ڕێبازێکی زانستییە بۆ دیاریکردنو چۆنییەتی بەکارهێنانی ئەو سامانە سروشتیو مرۆییانەی لە دەوڵەتێك، یان هەرێمێك، یاخود شارێك، یا شارۆچکەیەك بەدی دەکرێت، بە ئامانجی کەڵك وەرگرتنو پەرەپێدانی سامانەکەو چاککردنی باری کۆمەڵایەتیو ئابوری ئەو خەڵکەی تیایدا نیشتەجێبووە.

- بێنتۆن پلانسازی پێناسە دەکات بەوەی کە چەمکێکی گشتییە لەسەر ئامادەکردنی بیروهۆش بۆ چالاکی لە پێناو کاردا، واتە بیناکردنی هەر نەخشەیەکی زیهنی، بە بۆچوونی بێنتۆن پلانسازی هەموو کارێکی مەبەست دەگرێتەوە.. پێویستە وێنا بکرێتو پاشان لە خەیاڵدا جێگیر بکرێت، پێش ئەوەی لە واقیعدا شوێنی خۆی بگرێت، بەم پێیەش دەبێت مرۆڤەکان لە هەموو کاتێکدا مومارەسەی پلاندانان بکەن، ئەم واتایەی پلانسازیش هاوواتایە لەگەڵ فەرهەنگی ئۆکسفۆرد کە دەڵێت: پلانسازی هەموو شتێکەو بۆ هەموو کەسێکە.

**Planning means all things to all people... (Bruton, 1984, (p.11**

- وەکو زاراوەیەکی ئابوری پلانسازی بەوە دەناسرێت کە بریتییە لە کۆمەڵێك چالاکی یەك لە دوای یەك کە بە شێوازێك نەخشە دەکێشرێتو جێبەجێ دەکرێت بۆ چارەسەرکردنی کێشە ئابورییە دیاریکراوەکان (غنیم ١٩٨٨،ص ٢٢).

- بە شێوەیەکی گشتی پێناسە جیاوازو هەمەچەشنەکانی پلانسازی هەموو لایەنە جیاوازو فراوانەکان دەگرێتەوە بێئەوەی ئاماژە بە ڕێکەوتنی گشتگیری ڕاستەوخۆ بکات لە بۆچوونەکاندا، ئەگەر هاتوو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕێکەوتن هەبوو لەسەر کۆمەڵێ تەوەری سەرەکی، ئەوا دەکرێت بکرێتە ڕستە وەکو ئەمانەی خوارەوە: (Catanese and Snyder 1979,p.108)

١- پلانسازی چالاکییەکی مرۆیی بنچینەییە: پلاندانان بە چالاکییەکی مرۆیی گشتی دادەنرێت، کە لە ڕەفتاری مرۆڤدا لە تاکو کۆمەڵدا دەردەکەوێت، لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگەدا دەردەکەوێت، ئەم چەمکە پشت دەبەستێت بەو بنەمایەی کە (پلانسازی دابین کردنە)، بۆ نموونە دارتاش پلان دادەنێت کاتێک کە چەکوشێک دەکێشێت بە بزمارێکدا، هەروەها خاوەنکارێک پلان دادەنێت کاتێک کە گوێ لە هەواڵی کەشو هەوا دەگرێت بۆ ئەوەی چەتر لەگەڵ خۆی هەڵگرێت، یان نا... واتە شێوەکانی پلاندانان بەسادەیی، یان بە وردی بەکار دەهێنرێت لە ناو ماڵەکانو کۆمپانیاکانو دامەزراوەکاندا.

٢- پلاندانان هەڵبژاردنێکی ژیرانەیە: بریتییە لە شێوازی هەڵبژاردنی باشترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە کۆتاییەکی دیاریکراو، ئەم چەمکە پرۆسەی بەراوردکردنو دەستنیشانکردنی مەبەستەکان دەگرێتەوە، هەڵبژاردنی ژیرانە ئەو هەڵبژاردنەیە کە مەنتیقییە، بە پێی ئەمەش پلاندانان پرۆسەیەکە کە داهاتوو دیاری دەکات لەگەڵ ئەو سیمایانەی کە خوازراونو بە دوای یەکدا ڕیزکراون، ئاراستەکردنی داهاتوو تایبەتمەندییەکی پلاندانانە کە تێیدا هەڵبژاردنی گونجاو دیاری دەکرێتو دەبەسترێتەوە بە کارکردن تیایدا.

٣- پلاندانان ئاراستەیە بۆ کارکردنی داهاتوو: لێرەدا پلاندانان بەوە پێناسە دەکرێت کە توانای کۆنترۆڵ کردنی داهاتووە بە هۆی ڕووداوەکانی ئێستاوە، واتە پلاندانان بەکاردەهێنرێت بۆ دیاریکردنی داهاتوو.

٤- پلان دانان هۆکاری چارەسەری کێشەکانە: پلاندانان هۆکارێکی زانستیو بابەتییە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەو چارەسەری کێشەکان بە جۆرو قەبارەی جیاوازەوە، واتە پلاندانانی تەواو، گەرەنتی چارەسەری کێشەکان دەکات بە خێراییو بە کەمترین تێچوون.

## شار:

بێگومان لەو کاتەی مرۆڤ دروست بووە پێویستی بە شوێنێک هەبووە کە تیایدا بحەوێتەوەو پارێزراو بێت، سەرەتا لە ئەشکەوتو کوخەکاندا ژیاوەو لە جووڵەدا بووەو گەشەی کردووە، بە تێپەڕبوونی کاتو زۆربوونی دانیشتوان، بیریان لەوە کردووەتەوە کە لە شوێنێکدا جێگیر بنو ژیانیان مسۆگەر بکەن. هەڵبەت سەرەتا گوندیان دروستکردووەو شار بوونی نەبووە، بەڵام لە ئەنجامی زۆربوونی دانیشتوان ئەم گوندانە بوونەتە شارۆچکەو پاشان شار، لێرەدا پێناسەی شار لە چەند دیدگایەکەوە دەخەینە ڕوو:

- ئەرستۆ، بەم شێوەیە شار پێناسە دەکات: (شوێنێکە مرۆڤ تیایدا دەژی بۆ ئەوەی پارێزراوو ڕەسەنو ڕێز لێگیراو بێت)، هەروەها لە بواری سیاسەتیشدا نووسیوویەتی: (تاک پێویستە لە توانایدا بێت کە هەموو هاوڵاتییەکانی شارەکەی خۆی بناسێتەوە).

- ئەفلاتون شاری پێناسە کردووە بەوەی کە: (شاری نموونەیی پێویستە پێنج هەزار کەسی تێدابێت، زۆربەی شارەکان تا ڕادەیەک نزیکبوون لەم ژمارەیەوە، هەرچەندە ئەپیناو سیراکیوز ژمارەی دانیشتوانەکانیان لە بیست هەزار کەس زیاتر بووە).

- ئیبن خەلدون شار پێناسە دەکات بەوەی کە: (شار شوێنێکە بۆ سەقامگیریو پارێزراوی سەلامەتی مرۆڤ).

پێناسەی شار لە دیدگای ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٥٩ز:

١- ناوەندی کارگێڕی (بەڕێوەبردن) ناوەندێک کە هاوتا بێت لەگەڵ یەکێک لە دابەش بوونە کارگێڕییەکانی وڵات، یان بەشێک لەو دابەشبوونە دەگرێتەوە.

٢- قەبارەی دانیشتوان.

٣-قەڵەمڕەویەک دامودەزگای ناوخۆیی.

٤- تایبەتمەندییەکانی شار، وەکو نەخشەی وردو دەقیق، ڕێگاوبانی ڕێکو پێکو فراوانو قیرتاو کراو، بوونی کارەباو ئاوو خزمەتگوزارییە گشتییەکانی تر.

٥- جۆری چالاکی ئابوری، واتە نیو، یان ٢/٣ ی، یان بەشێکی دیاریکراو لە خەڵک سەرقاڵی جۆرەها کارن کشتوکاڵ نەبێت.

- پێناسەی شار لە دیدگای جان سرچاماکیو تۆماس فۆرد هۆڵت:

* جان سرچاماکی: (شارەکان پێکهاتوون لە دانیشتوانی جۆراوجۆرو فرە چەشن کە بەشێوەیەکی بەربڵاو لە تۆڕێک لە چالاکییەکاندا هاوکاری یەکتر دەکەن، شارییەکان بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانیان پێویستییان بە یەکتری دەبێتو هۆگری یەکتری دەبن، بەڵام لە هەمان کاتدا سەر بە گروپو فەرهەنگی کۆمەڵایەتی جیاجیان).

* تۆماس فۆرد هۆڵت: (شار بە شوێنێک دەوترێت کە دانیشتوانێکی تا ڕادەیەک قەرەباڵغو هەمیشەیی هەیەو سەرقاڵی جۆرەها کارن جگە لە کشتوکاڵ، لە پێناسەو یاسای ناوخۆی شاردا وا دادەنرێت کە ژمارەی دانیشتوان نابێت لە ٢٥٠٠ کەس کەمتر بێت).

پێناسەی شار لە دیدگای (عبدالحمید عبدالحمد):

(شار ئاواییەکی تا ڕادەیەک گەورەیە کە لە شەقامەکانو کۆڵانەکانو ماڵەکانو دوکانەکانو ناوەندی پیشەسازی، بازرگانی، کارگێڕیو فەرهەنگی پێکهاتووەو ژیانی زۆربەی دانیشتوانەکەی لەسەر کاسبیو بازرگانیو پیشەسازیو چالاکییە کارگێڕییەکان مسۆگەر دەبێت).

- پێناسەی فلیپ سلزنیکو لیۆنارد بروم بۆ شار:

(شار بە شوێنێک دەگوترێت کە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی لە دەوری یەکتر کۆ ببنەوەو پێکەوە بژینو کار بکەن، جگە لە ئەندازەو قەرەباڵغی دانیشتوان دەبێت ناهاوچەشنی دانیشتوان لە ڕووی تەمەنو ڕەگەزو کار لە نێوان دانیشتوانی شاردا لەبەرچاو بگیرێت).

- پێناسەی شار لە دیدگای ئامارناسانەوە:

ئامارناسان شار بە کۆبوونەوەی خەڵکەکان دەزانن کە لە خاڵێکی شوێنێکدا جێگیرو نیشتەجێبوون، بە مەرجێک ژمارەی دانیشتوانو قەرەباڵغی دانیشتووان لە ڕادەی پێویست کەمتر نەبێت.

لە ولایەتە یەکگرتووەکان ئەم سنورە لە ٢٥٠٠ کەسدایە، بەڵام ئەم ژمارەیە لەگەڵ مەرجی سروشتیو کۆمەڵایەتیو ئابوریدا دەگۆڕێت.

لە دانیمارک هەر شوێنێک ژمارەی دانیشتوانەکەی زیاتر بێت لە ٢٥٠٠ کەس بە شاری دادەنێن، لە کاتێکدا شار لە وڵاتی کۆریا نابێت لە ٤٠٠٠٠ کەس کەمتر بێت.

* بەشێوەیەکی گشتی لە پێناسەی شاردا دەبێت ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوە لەبەرچاو بگیرێت:

١- زانینی تایبەتمەندێتی سروشتی شوێنەکە، دیمەنی دەرەوەی شار، یان مۆرفۆلۆجی.

٢- بوونی دامودەزگای فێرکاری، پیشەسازی، بازرگانی، سیاسی، سەربازی، هونەری، کارگێڕی، ئابوری، تەندروستی.

٣- پێوەرەکانی کارو چالاکییە ئابورییەکان: بازرگانیکردن، شوێنی کاسبیکردن، پیشەسازیو چالاکی کارگێڕی.

٤- خزمەتگوزاری گشتی لە ڕووی ئاو، ئاوەڕۆ، کارەبا، تەلەفۆن، گاز، کتێبخانە، کوشتارگە، پارک، جادەوبانی ڕێکوپێکو فراوانو قیرتاو کراو، هۆکارەکانی بارکردنو گواستنەوەی گشتی.

٥- کارابوونی شارەوانی.

٦- ناهاوتاییو نا هاوچەشنی لە نێوان دانیشتوانی شارنشین دەرکەوێتو دیار بێت.

# پلاندانانو هێماكانی سەركەوتنی

ئارمان بەڵخەی

نەخشە هۆكارێكە بۆ ڕاپەڕاندنی كارەكان، بۆ گەیشتن بە ئامانجەكان لە داهاتوودا، سەرەتا بەرجەستە كردنێكی ئەو پێشهاتانەیە كە لە هزرتدایەو پێت وایە ئەو هۆكارانەت لە بەردەستدایە، لە داهاتوودا بەرجەستەیان بكەیتو بە ئامانجە خواستراوەكانت بگەیت.

ئەو وتە بە نرخەمان دێتەوە یاد: ئامانجمان لە دانانی پلان بۆ ڕوون دەكاتەوەو دەڵێت: كاتێك نوح كەشتی دروست كرد باران نەدەباری!

بۆ ئەوەی پلانەكەت سەركەوتوو بێت ڕەچاوی هەریەك لەم خاڵانە بكە:

*** گشتگیری (الشمولیة):**

پەیوەستبوونو پەیوەندیداركردنی سەرجەم ئەو چالاكیانەی كە لە ماوەی ڕاپەڕاندنی پلانەكەدا دێنە مەیدانی جێبەجێكردنو هەر یەك لەو چالاكیانەی بە پێی ئەو بایەخەی كە ئامانجی پلانەكەت پێی داوە بگرێتەوە.

چونكە سەرجەم چالاكییەكان لە سەرەتای دانانی پلانەوە تا گەیشتن بە ئامانجە خواستراوەكان هەریەكەیان پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ڕاپەڕاندنی چالاكی دوای خۆیان، بەمەش پلانی ویستراو سەركەوتن مسۆگەر ناكات، ئەگەر شێوازی گشتگیری لە ڕەهەندی خۆیدا نەگرێتەبەر.

*** گونجان لەگەڵ واقیعدا:**

پێویستە ئەو پلانەی كە دایدەڕێژیت لەگەڵ ئەو واقیعەدا بگونجێت، بە واتایەكی تر تاچەند پلانی دارێژراو بۆ گەیشتن بە ئامانج لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا دەگونجێت كە پلانەكەت تێیدا دەیەوێت بگات بە ئامانجەكانیو پەیوەستبوونی زیادكردنی تواناكانو باشتر ڕاپەڕاندنی كارەكان پەیوەندی بەم خاڵەوە هەیە بەوەی بە دروست بڕیاردانی دەبێتە هۆی كەمكردنەوەی ئەو كۆسپانەی كە ڕێگر دەبن لە جێبەجێكردنی پلانەكەتدا. بە ڕوویەكی تردا پێچەوانە دەبێتەوەو هەر لە سەرەتاوە كۆمەڵێك ئاستەنگ دێتە پێشەوە ئەگەر ڕەچاوی ژینگە نەكرێت لە دارشتنیدا.

*** هەماهەنگی (تنسیق):**

گونجاندنو دروستكردنی پەیوەندی لە ئاست ئامانجەكانی پلانو ئەو شێوازو ڕێگایانەی پێویستن بۆ هێنانەدی ئامانجە خوازراوەكانت، بۆیە گونجاندن بە داینەمۆی پلان دادەنرێتو ئاسان جێبەجێكردنیشی هەر بۆ ئەو دەگەڕێتەوە.

* شێوازی جێبەجێكردنی: دوو شێواز لە جێبەجێكردنو بڕیاردانی پلاندا هەیە، ئەوانیش (مەركەزیەتو لامەركەزیەت)ن، لە یەكەمدا دەزگای ناوەند، یان بە واتایەكی تر دەسەڵاتی ناوەند، هەڵدەستێ بە دەركردنی بڕیارەكان، بەڵام لە دووەمدا ئەو دەسەڵاتە تەنها لە ناوەندەوە نابێت، بڕیاردانو دەسەڵاتی بڕیاردان بە دەسەڵاتەكانی دیكەی سەر بە ناوەندا دێتە خوارەوەو ڕێگە پێدراو دەبن لە بڕیارداندا لە لایەن دەسەڵاتی ناوەندەوە. كە ئەمەیان لەسەر هزرو بۆچوونت دەبێت لە دیاریكردنی هەریەكەیاندا.

*** نەرمی نواندن، (مرونە):**

تایبەتمەندییەكی دیكەی پلان ئەوەیە نەرمو نیان بێت، بە واتایەكی تر بوار هەبێت بۆ بە ئەنجامگەیاندنی گۆڕانكاری تیایدا بۆ گەیشتن بە ئامانجە دەستنیشان كراوەكانت لە هەمان كاتدا بوارت بۆ برەخسێنێت كە بە دەم گۆڕانكارییە لە ناكاوەكانەوە بچیتو بەربەست بیت لە بەردەم جێبەجێ نەكردنی پلانەكەدا، بۆ ئەوەی كاریگەری، یان ڕێڕەوی پلانەكەت ڕوو لە شكست نەكات، لەو كاتەدا گرنگی نەرمونیانی پلانەكەت دێتە كایەوە كە لە شكست ڕزگارت دەكاتو پێت دەڵێت: سەركەوتنت بەندە بە دۆزینەوەی ئاستێكی هەموار بۆ مانەوەتو بەردەوام بوونت.

*** پابەند بوون، (التزام):**

پێویستە هەموو لایەنەكانی ڕێكخراوەكەت پابەند بكەیت بەو سەرەتاو پەیڕەوو پڕۆگرامانەی كە لە ماوەی جێبەجێكردنیدا تا گەیشتن بە ئامانجەكان داوای دەكات، چونكە وەك باسمان كردن پلان گشتییەو هێنانەدی ئامانجەكانی هێنانەدی ئامانجی تاكەكانیەتی، بۆیە دەبێت هەموو پابەند بن پێوەیو دڵنیابن لە سەركەوتنیدا.

*** بەردەوامی (استمراریە):**

لە كاتی جێبەجێكردنیدا بێ گوێدانە جۆرەكەی، بێگومان پێویستی بە بەدواداچوونو لێكۆڵینەوە دەبێت بۆ كەمكردنەوەی كاریگەری بەربەستەكانو مانەوەی ئەو هۆكارانەو زیاد كردنیان كە پێویستن بۆ لە كار نەكەوتنی پلانەكەو نە پچڕاندنی تا دەگاتە ئامانجە خوازراوەكان.

*** بەدواداچوون (المتابعە):**

لەسەردەستەی پلانەكەت پێویستە كە كۆمەڵێك ڕێساو ڕێنمایی دەركات لە شێوەی دەستورێكدا بۆ دڵنیابوون لەوەی كە ئایا ئەو ڕێڕەوەی پلانەكەی پێدا تێپەڕ دەبێت، هەمان ڕێڕەوە كە لە ڕابردوودا نەخشەی بۆ كێشرابوو، بە واتای چاودێریكردنی پلانی خواستراوو ئەو پلانەی ئێستا لە واقیعدا جێبەجێ دەكرێت، هاوتان. لە هەمان كاتدا هەوڵدان بۆ جێبەجێكردنی چالاكییەكانی داهاتوو تا گەیشتن بە ئامانجە خواستراوەكان، تا ماوەی تێپەڕبوونی پلانەكە بەردەوام دەبێت.

و/ ئەسکەندەر ڕەحیم

# ئەو ئاکارانەی بەڕێوەبەرەکان سەغڵەت دەکەن!



هەندێک ئاکاری ناپەسەند هەن، کە کارمەندان پەیڕەویی دەکەنو بەڕێوەبەرەکانیشیان پێیان سەغڵەت دەبن.. لێرەدا دەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەدا، کورتیان بکەینەوە:

**١- درێژدادڕیو زۆر قسەکردن:**

بەڕێوەبەر لەگەڵ ئەو کارمەندانەی کاتی خۆیانو هاوکارەکانیان بە درێژدادڕیو قسەی زۆرو بێ سوود بەفیڕۆ دەدەن، بێزارو ماندوو سەغڵەت دەبێت.

بۆیە نێوانخۆشی خۆت لەگەڵ هاوکارەکانتدا بپارێزە، بەرپرسانە کاربکەو ببە بە جێمتمانە.. چاوەڕێش مەکە، تا سەرنجی بەڕێوەبەرەکەت بۆ لای فرەبێژییەکەت ڕابکێشیت. وتووێژە لاوەکییەکانت کەم بکەرەوە.. بۆ کاتی پشوودان، یان بۆ کاتی نانخواردن، یان بۆ دوای دەوام، دوای بخە. هاوکارەکانیشت، بۆ هەمان شت هەڵبنێ.

**٢- نەشارەزایی لە ئەرکەکاندا:**

بە خەمساردیی کارمەندەکانو نەشارەزاییان لەو ئەرکانەی پێیان سپێردراوە، بەڕێوەبەرەکان بێزار دەبن.. بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە کارمەندەکان، بە پێچەوانەی ئەو شێوازەی لەسەری ڕاهێنراون، کار دەکەنو سەرپێچی لەو ڕێنماییە ڕوونو ڕاستەوخۆیانەش دەکەن، کە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان بە باشترین شێوە، دانراون. بۆ نموونە: ئەگەر بەڕێوەبەر، فەرمان بە کارمەندەکانی بکات کە بەڵگەنامەو دۆسییەکان، بەشێوازێك ڕیزبەند بکەن.. کارمەندێکیش سەرپێچی لەم ڕیزبەندییە بکات، بە جۆرێك کە دەبێت بە هۆی ونبوونی بەڵگەنامەکان، یان پەکخستنی ڕەوتی کار.. ئەوا جامی تووڕەبوونی بەڕێوەبەر سەرڕێژ دەکات.

دەیسا بۆئەوەی نەبێت بە مایەی ڕووزەردیی بەڕێوەبەرەکەت لەبەرچاوی کەسانی دەرەوەی دەزگاکەدا، ئەوا بەر لەوەی دەست بە جێبەجێکردنی هەر گەلاڵەو پرۆژەیەك بکەیت، دڵنیا بە لەوەی کە بە تەواوەتی.. سەر لە ڕێنماییەکانی بەڕێوەبەرەکەت دەردەکەیت، هەمدیسان پێش ئەوەشی هەواڵی کارەکانت بە بەڕێوەبەرەکەت ڕابگەیەنیت.. چیت ڕاپەڕاندووە، بەسەریدا بچۆرەوە، تا لەوەی هیچت فەرامۆش نەکردووە، بێخەم بیت. بەم کارەشت، خۆتو بەڕێوەبەرەکەت، لە سەغڵەتیو ڕووگیری دەپارێزیت.

**٣- ناکۆکیو ململانێی نێوان کارمەندان:**

ناتەبایيو کێشمەکێش لە نێوان کارمەنداندا.. بەڕێوەبەر داماوو تێماو دەکاتو دەیخاتە نێو سەختیو سەغڵەتییەوە، کە هیچ کەسێك ئاوات بەو حاڵوباڵەی ناخوازێت. بێگومان فەرامۆشکردنی ئەو هەڵنەکردنو نەیارییانەش، کاروبار ناڵەبار دەکاتو شپرزەییو دڵەڕاوکێ لە نێو دەزگاکەدا، دەوروژێنێتو لایەنگریش لە هەر لایەك، دەمەقرێ گەورەترو پەرتبوون پتر دەکات. ڕەنگە هەر خۆوەردانێکی بەڕێوەبەریش، بۆ چارەسەری گرفتەکان.. بە لایەکدا -کە پەیوەندی نێوان کارمەندەکان بشێوێنێت- بشکێتەوە.

خۆنەگەر تۆ بەرەیەکی ناو بەربەرەکانێی دەزگاکەت بوویت، ئەوا هەر زوو لەگەڵ بەرەکەی دیکەدا - یا پۆزش بۆهێنانەوە، یا چاوپۆشی لێکردنیش بخوازێت- هەوڵی گەیشتن بە پێکهاتنەوەیەکی دادگەرانە بدە. چی پێویستە بۆ دوایيهێنانی گرفتەکە، ئەنجامی بدە.. هەموو ئەو هەنگاوانەشی لە ئایندەدا، لەم هەڵومەرجە نەخوازراوە، بەدوورت دەگرن، بگرە بەر.

**٤- هەڵسوکەوتە خراپەکان:**

کاتێك کارمەندان، هەست بە بێهوایی، یا نەنرخاندنی کاریان دەکەن.. چەند هەڵسوکوتێکی ناپەسەندیان لێ دەوەشێتەوە، بڕێ جاریش ئەم هەڵسوکەوتە خراپانە، لە نێو گشت کارمەندەکاندا، تەشەنە دەسێنێت.

ئەگەر سەرنجت دا، ببوویت بە کەسێك کە زوو هەڵدەچێتو زۆر دەم بەگلەییە، هەروەها تینوتاوت بۆ کارەکەت، ڕووی لە کزی کردبوو.. ئەوا لەگەڵ خۆتدا بکەورە نێو وتووێژەوەو سۆراغێکی ئەو هۆکارانە بکە، کە بوون بە مایەی گۆڕانی سروشتی ڕەوشتو خراپبوونی هەوای دڵت.. هەمدیس بچۆرە بنجوبناوانی ئەو شتانەی کە بوون بە هۆی ئەوەی، ئەو شتە نەشیاوانەت لێ بووەشێتەوە، پاشان هەوڵی دۆزینەوەی چارەی ئەو گرفتەی ڕووبەڕووت بووەتەوە، بدە.. یا ڕێکوڕاست لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەتدا، سەبارەت بەو شتانەی پەستت دەکەن، بدوێ.

**٥- خۆنەشیاویو وەلانانی پاکو خاوێنی:**

بڕێ ناخۆشە، بە کەسێك بڵێین: پێویستە زۆرتر بایەخ بە خاوێنی خۆت بدەیت. خۆت بۆنخۆش بکەو ڕۆژانە ددانت بشۆرە.. تا بۆنی دەمت خۆش ببێت.

بۆیە پێویست ناکات، کارمەند چاوەڕێی ئەوە بکات، کەسێك ڕێنوێنی بکات.. تا بایەخ بە خاوێنی خۆیو جەستەی بدات.. بەڵکو دەبێت بەرلەوەی بەرەو کار بکەوێتەسەر ڕێ، بەشێنەیی لە ئاوێنەدا، تەماشایەکی خۆی بکات.

**٦- ڕەخنەگرتن لە سەرمووچەو پلەبەرزکردنەوەدا:**

زۆرجار کارمەند، لە هەمبەر ڕەتکردنەوەی داوای سەرمووچەو پلەبەرزکردنەوەکەی، تووڕەییو بێزاری دەردەبڕێتو دەست بە لێخوێندنو ڕەخنەگرتن دەکات.

سا ئەگەر بەڕێوەبەرەکەت ڕەتی کردەوە، سەرمووچەو پلەبەرزکردنەوەت پێ بدات.. ئەوا دوای ڕوونکردنەوەی ئەو هۆکارانەی بوون بە مایەی ئەم ڕەتکردنەوەیە، هەروەها ئەو لەمپەرانەی هاتوونەتە سەر ڕێی ئەم پلەبەرزکردنەوەیە، لێ بکە، پاشان لە نزیکترین هەلدا، داوای پارمەتی لێ بکە.. تا سەرمووچەو پلەبەرزکردنەوە، بە دەست بهێنیت. وەهاش نەکەیت کە هەستی بێهوایی، بەسەرتدا زاڵ ببێت.. ئیدی تۆش هەڵویستێکی دوژمنانە بگریتەبەر.

سەرچاوە: علاقات: ٤٨



بەشی یەکەم

وەهاب حەسیب





# پەیوەندی گشتی

چەمکی پەیوەندی گشتی:

هەموو دامەزراوەیەك گەورە، یان بچووك، گشتی، یان تایبەتی، تا بتوانێت بەردەوامو سەرکەوتوو بێت، پێویستی بە پشتگیری پەیوەندییە لەسەر بنەمای خۆشەویستیو لێکگەیشتن لە نێوان دامەزراوەکەو ئەو خەڵکانەی لە ناوەوەو دەرەوەدا هەڵسوکەوتی لە گەڵدا دەکات، زۆربەی کات ئەوانەی ئەم ئامانجانە تەواو دەکەن ناودەبرێن بە (فەرمانگەی پەیوەندییە گشتییەکان لە دامەزراوەکەدا).

مەبەست لە پەیوەندی گشتی چییە؟

(ئیفی لی) کە بە باوکی پەیوەندی گشتی ناودەبرێت: پێیوایە ئەرکی پەیوەندی گشتی پەیوەستە بە ڕاگەیاندنو بڵاوکردنەوەی زانیاری ڕاستەقینە لە بارەی دامەزراوەکەوە بۆ خەڵکی تا بتوانێت باوەڕو خۆشەویستی خەڵك بەدەست بهێنێت.

هەندێکی کە پێیان وایە پەیوەندی گشتی بریتییە لە (نوێنەر) لە نێوانی خەڵكو دامەزراوەکەدا، یان ئەندازیاری پەیوەندییە لە نێوان ئەو دوو لایەنەدا، یاخود هونەری پەیوەندییە لەگەڵ خەڵکداو بەدەستهێنانی باوەڕو پشتگیریانە بۆ دامەزراوەکە.

لەم شرۆڤانەوە دەتوانین بڵێین: پەیوەندی گشتی بریتییە لە: کۆششێکی نەخشە بۆ کێشراوی بەردەوامی ئامانجدار کە بەڕێوەبەرایەتی دامەزراوەکە پێیهەڵدەستێت، بە مەبەستی لێکگەیشتنێکی دوولایەنەو بوونی پەیوەندییەکی ئاسایی لە نێوان دامەزراوەکەو ئەو خەڵکانەی لە ناوەوەو دەرەوەدا هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکات لە ڕێگای بڵاوکراوەو ڕاگەیاندنو پەیوەندی تاکە کەسەوە، بەشێوەیەك لە کۆتاییدا بتوانێت هاوسەنگییەك لە نێوان دامەزراوەکەو ڕای گشتیدا دروست بکات.

بنەماو بناغەکانی پەیوەندی گشتی:

بنەماو بناغەکانی پەیوەندی گشتی گەلێکن بە تایبەت ئەوانەی لە بواری پەیوەندی گشتیدا کاریپێدەکرێتو پشتی پێدەبەسترێت گرنگترینیان بریتییە لە:

١- سەرەتا دەستپێکردنی کار لە ناو دامەزراوەکەدا دەبێت ئەوەش بە دروستکردنی کەشێکی لێکگەیشتنی دوو لایەنە لە نێوان دامەزراوەکەو هەموو کارمەندانی، کارکردن بۆ یەکڕیزیو پشتگیری گیانی تەباییو هاوکاری نێوان کارمەندانو کرێکارانی دامەزراوەکە، هەوڵدان بۆ دابینکردنی هەموو هۆکارێك کە گیانی مەعنەوی نێوانیان لە ئاستێکی بەرزدا دەهێڵێتەوە، ئەم کارەش بریتییە لە گرنگیدان بە پێداویستیو بیرو بۆچوونەکانیانو بەهەند وەرگرتنیان لە کاتی دەرکردنی بڕیارەکاندا. ئەمەش یەکگرتنو پاڵپشتی فەرمانبەر، یان کرێکار بۆ دامەزراوەکە دروست دەکات.

٢- ڕەچاوکردنی ڕاستگۆییو دەستپاکی لە ڕاڤەکردنی هەرشتێك لە لایەن دامەزراوەکەوە دەردەچێت بە مەبەستی بە دەستهێنانی باوەڕو ڕەزامەندی خەڵك، تا دامەزراوەکە سەرکەوتوو بەردەوام بێت، ڕاستگۆییو دەستپاکی زمانیی دڵنیایین بۆ تەواوکردنی دەستکەوتەکان لە ماوەیەکی دوورمەودادا، کاتێك خەڵك بۆیان ڕوونبووەوە ئەوەی دامەزراوەکە بە دەستی هێناوە لە باوەڕو لایەنگری لەسەر بنەمایەکی ناڕاست بووە، ئەوا پەرچەکرداری خەڵك بریتی دەبێت لە تۆڵەسەندنەوە بە شێوەیەکی سروشتی، ئەوەش بریتییە لە بێبەشکردنی دامەزراوەکە لەهەر دەستکەوتێك لە داهاتوودا.

٣- پەیوەست بوون بە شێوازی پیشەییو دادپەروەری لە ئامانجەکاندا، یەکخستنی کردارو گوفتارو شوێنکەوتنی بنەماو بەها بەرزەکان لە هەڵسوکەوتدا، دامەزراوە بۆئەوەی باوەڕی کارمەندانی ناوخۆیی بە دەست بهێنێت، پێویستە بنەماکانی دادپەروەری پیادەکات لە: پاداشتو پشوو سزدا، پێویستە هەڵسوکەوتی بەشێوەیەك بێت کە ئاشکرا بێتو هیچ لێکدانەوەیەك هەڵنەگرێت، ئەوەی پەیوەندی بە خەڵکانی دەرەوەی دامەزراوەکەوە هەیە، پێویستە شوێنکەوتەی بنەماکانی ژیر بێژیو ئاکار بێت لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەو خەڵکانەداو گوفتارو پەیمانەکانی بکات بە ڕاستییەکی هەستپێکراوو کارێکی بنیاتنەر.

٤- بەشداری لە خۆشگوزەرانی کۆمەڵگاو پێشکەوتنی تاکەکانی بەدەر لەوەی مەبەستی ئەم هەنگاوە تەنها قازانجی مادی بێت. ئەم کارەش هۆکاری پشتگیری دامەزراوەکەیە لە ئاستی ناوخۆو دەرەوەدا، لەسەر ئاستی ناوخۆ پێویستە دامەزراوەکە بەشێك لە دەستکەوتەکانی دابەشبکات بەسەر کرێکارەکاندا، یان هەندێك کاری خزمەتگوزاری پێشکەش بکات کە کرێکارانو خانەوادەکانیان سوودمەند بن لێی کە هۆکاری بەرزبوونەوەی ڕۆحی مەعنەوییانە دواتر بە شێوەیەکی باش بەسەر بەرهەمهێناندا

کاریگەری دەردەکەوێت. لەسەر ئاستی دەرەوە دامەزراوەکە پێویستە هەندێك خزمەتگوزاری گشتی دروست بکات، وەك نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستیو باخچەیی گشتیو شوێنی حەوانەوەو... هتد. کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا بتوانن لێی سوود مەندبن، ئەم هەنگاوانەش باوەڕی خەڵکی لە دەرەوەی دامەزراوەکە بەهێز دەکات بەرامبەری.

٥- هاوکاری لەگەڵ دامەزراوەکانی کەداو ڕێکەوتن لەسەر هێڵی گشتی لە چوارچێوەی پەیوەندی گشتیدا، تا هەمووان بتوانن سەرکەوتن بە دەست بهێنن. وەك ئەوەی دامەزراوەکە هەڵسێت بەکردنەوەی هۆڵێکی وەرزشی کە هەموو پێداویستییەکانی تیادا دابینکرابێت، یاخود بانگەوازکردن بۆ شمەکێکی نیشتمانی لە وڵاتێکی بێگانەدا لە میانەی کردنەوەی پێشانگاو لێدوانی نێودەوڵەتییەوە.

٦- شوێنکەوتنی لێکۆڵینەوەی زانستی بنیاتنراو لەسەر ژیربێژیو شیکاری بابەتیانە لە شرۆڤەی کێشەکاندا، تا لە توانادا بێت بگەین بە بڕیارێکی دروست، شیکاری هەڕەمەکیانە کە شوێنکەوتەی زانستو ژیربێژیو بابەتیانە نییە، ئەنجامەکەی خراپ بەسەر ڕێکخراوەکەدا دەشکێتەوە، دابەزینی ئاستی بەرهەم هێنان بە سزادانو بێبەشکردنی کرێکاران لە پشوو پاداشت بەرز نابێتەوە، بەڵکو بەگەڕان بە شوێن هۆکارە شاراوەکاندا دەبێت، وەك نەگونجاندنی کرێکاران لەگەڵ یەکتۆرداو پەیوەندییان لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیو پەیوەندی نێوانیان هەندێکیان لەگەڵ ئەوانی دیکەداو ...هتد.

پیشەکانی پەیوەندی گشتی:

١- دانانی پلانو نەخشەکێشانو سیاساتی گشتی لە دامەزراوەکەدا، پلانو دارشتنی پەیوەندی ئاساییو لێکگەیشتن لە نێوان دامەزراوەکەو دامەزراوەکانی تردا، لە نێوان دامەزراوەکەو هۆکارەکانی گەیاندندا، لە نێوان دامەزراوەکەو دەستگا دەوڵەتییەکاندا.

٢- ڕێکخستن لە نێوان دامەزراوەکەو دەستگاو بەرژەوەندییە جیاوازەکان لە کۆمەڵگادا تەواوکردن بە مەبەستی تەواوکاری لە کارلێکی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگادا، ڕێکخستن لە نێوان بەڕێوەبەرایەتییە جیاوازەکانی دامەزراوەکە بە مەبەستی گونجاندنو تێکەڵبوون لەگەڵ خەڵکی لە ناوەوەو دەرەوەی دامەزراوەکەدا.

٣- خزمەتکردنی کارکەرانو چاودێرییان لە لایەنی دەروونیو کۆمەڵایەتیو تەندروستییەوە.

٤- ئاگادارکردنەوەی خەڵکی لە دامەزراوەکەو شیکردنەوەی خزمەتگوزارییەکانیو ئەو ڕۆڵەی لە کۆمەڵگادا پیادەی دەکات بە شێوازێکی ئاسانو ڕاستو ورد، ئاگادارکردنەوەی ئەو خەڵکانەی لە دەرەوەی دامەزراوەکەن بە پلانی دامەزراوەکەو ناساندنی هەر گۆڕانکارییەكو ڕاستکردنەوەیەكو زیادەیەك لە چالاکییەکانی، پێدانی خەڵکی بە هەر زانیارییەك بۆ یارمەتیدانو دروستکردنی ڕای گشتی بینا لەسەر بنەمای ڕاستی.

٥- دروستکردنی پەیوەندی ئاسایی بینا لەسەر لێکگەیشتنی دوو لایەنە لە نێوان دامەزراوەکەو کەسەکاندا، لە نێوان کەسەکان خۆیانداو لە نێوان ئەو کۆمەڵانەی لە دەرەوەو ناوەوەی دامەزراوەکەدان یارمەتیو هاندانی تێکەڵاوی کۆمەڵایەتیو پەیوەندی لە نێوان ئاستە جیاوازەکانی دامەزراوەکەدا.

٦- هاوکاری دەستەی بەڕێوەبەرایەتی بە بۆچوونی هونەریو بەشداریکردن لە دانانی پلانی گشتی دامەزراوەکەو ئاگادارکردنەوەی دەستەیی بەڕێوەبەرایەتی بە پەرچەکرداری پلانەکانی لە نێوان خەڵکانی دەرەوەو ناوەوەی دامەزراوەکەدا.

بوارەکانی پەیوەندی گشتی:

بوارەکانی پەیوەندی گشتی جیاوازو جۆراو جۆرن، لێرەدا تەنها گرنگی دەدەین بەو بوارانەی زیاد گرنگو دیارن.

١- کرێکارانو فەرمانبەران یەکێکن لە کۆڵەکەکانی دامەزراوەکە، گەشەکردنو پێشکەوتنو سەرکەوتنی تاڕادەیەك وەستاوەتە سەرپشتگیریو خۆشەویستیان بۆ دامەزراوەکە. ئەم پشتگیریو خۆشەویستییە لە لایەك بریتییە لە باوەڕو خۆشەویستی کە لە نێوان پەیوەندی کرێکاراندا دەردەکەوێتو لایەکی کە وەستاوەتە سەر نێوان کرێکارانو فەرمانبەرانو بەڕێوەبەرایەتی دامەزراوەکە، دامەزراوەکە ناتوانێت ئامانجە چاوەڕوانکراوەکانی بە دیبهێنێت، گەر تێکەڵاوییەك لە نێوان کرێکارانو فەرمانبەراندا دروست نەکات، ئەمەش کاتێك دروست دەبێت کارمەندان هەست بکەن بەشێکن لە دامەزراوەکەو بەشدارن لە دەرکردنی ئەو بڕیارانەی پەیوەستن بە چارەنووسی دامەزراوەکەو کارمەندانەوە. بە نموونە کۆمپانیای تویۆتای یابانی لەسەر ئاستی جیهان ناسراوە، کاتێك پرسیار لە کارمەندێك دەکەیت نالێت من ژمێریار، یان ئەندازیاری کۆمپانیای تویۆتام، دەڵێت: من (لە کۆمپانیای تویۆتا کار دەکەم) هۆکاریش ئەوەیە کە ئەو ڕۆچووە لە بڕیارە تایبەتییەکانی کۆمپانیای ناوبراودا، چون کارمەندانی کۆمپانیای تویۆتا بە بەردەوامی جێگۆڕکێیان پێدەکرێت لە شوێنی کارکردنیان لە ناو کۆمپانیاکەدا بەو پێیە وەڵامی کارمەندان پێش گفتوگۆیان دەکەوێت لە وەها دۆخێکدا.

٢- هەر دامەزراوەیەك جۆرێك لە پەیوەندی هەیە لەگەڵ دامەزراوەو فەرمانگە حکومییەکاندا، پێویستە ئەم پەیوەندییانە لە ئاستێکی باشو هاوکاری یەکتربن بۆ تەواوکردنی ئامانجە چاوەڕوانکراوەکان، گرنگترینیان بریتین لە:

أ- پشتگیری هەر شتێك کە پەیامی ڕێکخراوەکە بێت لە پێناو خزمەتکردنی نیشتماندا.

ب- پشتگیری پەیوەندی گشتیو کەسی لە نێوان دامەزراوەکەو بەڕێوەبەرایەتییەکانو وەزارەتەکانو بەرژەوەندییە جیاوازەکاندا.

ج- بەسەرکردنەوەی دامەزراوە حکومییەکان لە چالاکییەکانی دامەزراوەکە، لە چوارچێوەی گشتی کۆمەڵگادا.

ئەم ئامانجانەش بەم شێوەیە بە دەست دێن:

١- بانگهێشتکردنی بەر پرسە حکومییەکان بۆ وانەو لێدوان کە لە بۆنە جیاوازەکاندا ڕێکدەخرێن.

٢- پەیوەندی گشتی ڕاستەوخۆو بەردەوام لەگەڵ کەسایەتییە ناسراوەکانو بەرپرسە حکومییەکان لە دامەزراوەکانی دەوڵەتدا.

٣- بەسەرکردنەوەی دامەزراوە حکومییە جیاوازەکان بە بڵاوکراوەو گۆڤارەکانی دامەزراوەکە.



ئا: ئاوات جەمال

# کەرتی تایبەت و بەرژەوەندی تایبەت

کەرتی تایبەت بەوە جیادەکرێتەوە لە کەرتی گشتی کە خاوەندارێتی دەگەڕێتەوە بۆ تاکە کەسێك، یان چەند کەسێکی دیاریکراو، هەموو قازانج و زیانەکانیشی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو کەسانە، کەواتە کەرتی تایبەت کۆمەڵێك سودو چاکەی بۆ بەرژەوەندی کەسێك، یان کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراوی تێدایە کە بریتین لەمانە:

**١- هەستکردن بەڕازیبوون:**

هەندێ کەس باوەڕیان وایە ئەو پاداشتە سەرەکییەی کە دەست ئەو کەسە دەکەوێت کە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کاردەکات، بریتییە لە هەستکردن بە ڕازیبوون، ئەو هەستکردنەش مانای ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت بە ئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت بکات لە ژیانی خۆیدا، چونکە کارکردن بۆ بەرژەوەندی تایبەتی دەرفەت دەرەخسێنێت بۆ ئەو کەسە کە گشت ڕۆژەکانی کارکردنی لە کارو پیشەیەکدا بەڕێبکات کە پێی خۆشحاڵەو حەزی پێدەکات، بۆ نموونە کەسێك حەزی لە کاری وێنەگرییە بۆیە دەتوانێت ستۆدیۆیەکی تایبەت بە خۆی بنیاد بنێت، ئەگەر هاتوو یەکێك لە کڕیارەکانی وێنەکەی بە دڵ بوو، دەستخۆشی لێکرد، لێرەوە ئەم وێنەگرە هەست دەکات بووەتە مایەی ئاسوودەکردنی دەوروبەرەکەیی و خزمەتێکی کۆمەڵگەکەی کردووە ئەمەش دەبێتە هۆی ڕازیبوون لە پیشەکەی.

**٢- سەربەخۆیی:**

سەربەخۆیی پاداشت و چاکەیەکی تر دەنوێنێ لە کارکردنی کەسێك بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی، سەربەخۆیی ڕزگاربوونە لە کۆنتڕۆڵ کردنت لە لایەن ئەوانی ترەوە، بە شێوەیەك مرۆڤ دەتوانێت زانیاری و شارەزایی و تواناکانی لەو شتەدا بەکاربهێنێت کە پێی وایە لە گەڵیدا دەگونجێت، هەر ئەویش بەرپرسیارێتی دەگرێتە ئەستۆو بڕیارەکان دەردەکات بێئەوەی پێویست بێت لەسەری ڕەزامەندی کەسێکی تر وەربگرێت.

**٣- ئاسایشی کار:**

زۆرێك لە کۆمپانیاکان لە سەر دەستی کەسانێك بنیاد دەنرێت کە لە ئاسایشی کار دەگەڕێن کە ڕەنگە لە هەموو شوێنێك بۆیان نەڕەخسێت، بێگومان ئاسایشی کارکردن بریتییە لە گرەنتی بەردەوامبوون لە کارو بەدەستهێنانی داهات، چونکە ناکرێت کەسێك کە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کار دەکات لاببرێت، یان دەربکرێت لەسەر کارەکەی، یاخود بە زۆر دەستی پێ لە کاربکێشرێتەوە کە دەگاتە تەمەنێکی دیاریکراو.

**٤- قازانج و داهات:**

قازانج یەکێکە لەو چاوەڕوانکراوانەی کە لە بنیادنانی هەر پرۆژەیەکی نوێدا لەبەرچاو دەگیرێت، قازانج ئەو بڕە پارەیەیە کە لە داهاتەکە دەمێنێتەوە دوای لێدەرکردنی هەموو تێچوونەکان، ئەم قازانجەش دەچێتە خەزێنەی خاوەنی پرۆژەکەوە.

کاتێك یەکێك بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کاردەکات دەتوانێت کۆنتڕۆڵی داهاتەکەی بکات و چەندیش ماندوو ببێت و باشترو وردتر کاتەکانی و داهاتەکەی بەگەڕبخات بە هەمان ڕادە دەستهاتەکەشی زیاد دەکات.

بەڵام ئەگەر هەر ئەو کەسە لای یەکێکی تر کار بکات، بێگومان هەمان دەستهات و زیادبوونی قازانجی نابێت، ڕەنگە زیاتر ماندووش بێت.

بە دڵنیاییەوە قازانج و دەستهات لە پرۆژەیەکەوە بۆ پرۆژەیەکی تر دەگۆڕێت و بەندە بە جۆری پرۆژەکەو ڕادەی بڕی داهات و چۆنییەتی بەگەڕخستنی دەرامەتەکان.

هەروەها ڕەخساندنی هەلی کارکردن و بە گەڕخستنی دەستی کاری ناوخۆو دابینکردنی بەشێکی زۆری خزمەتگوزارییە جیاوازەکان و بە کارخستنی سەرمایەو ئاڵوگۆڕپێکردنی دارایی بانکەکان و کەلوپەل و کەرەستەی پرۆژە ناوخۆییەکان میکانزمێکی باشن بۆ گەشەپێدان و بەدەستهێنانی قازانج بۆ کۆمەڵگە بەگشتی.

**٥- پلەوپایە:**

ئەم وشەیە بۆ وەسفکردنی کەسی خاوەن پیشەو پرۆژە تایبەتەکەی بەکاردەهێنرێت، ئەو کەسەی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کاردەکات گرنگی و بایەخێکی زۆر دەدات بە پەیوەندییەکانی لەگەڵ کارمەندەکانی و کڕیارانی، ئەمەش پلەوپایەیەکی کارگێڕی و کۆمەڵایەتی بۆ دەستەبەر دەکات کە ڕەنگە ئاستی پلەوپایەی فەرمانبەرانی ئاسایی تێبپەڕێنێ، ئەمەش هەستی شانازیکردن و خۆشویستنی پیشەکەی لادروست دەکات.

بێگومان زۆرێك لە خەڵکی حەز بە پلەو پایەو ناوبانگ دەکەن، بەڵام ئەمەش وا بە ئاسانی بەدەست نایەت، بەڵکو پێویستی بە هەوڵدانی دڵسۆزانەو کۆششکردنی مرۆییانە هەیە.

**٦- نەرمونیانی و توانای گونجان (المرونة):**

هەندێك لە تاکەکان کە ڕوودەکەنە کەرتی تایبەت بە ئامانجی کارکردن بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، چەندین هەڵبژاردنیان لە بەردەمدایەو هەلی بنیادنانی پرۆژەی هەمەجۆریان بۆ دەڕەخسێت کە لەگەڵ تواناکانیان و داهاتەکەیاندا گونجاوە، هەروەها ئەو کەسەی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی کاردەکات لە پلەو پۆستی خاوەنکارو سەرۆکدایە لە جیاتی ئەوەی کرێکارو شوێنکەوتوو، جێبەجێکار بێت.

سەرچاوە: کتێبی (کاپ) لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی.

# بە ئەقڵو زیرەکی.. نەک بەهێزی بازوو

و: محەمەد مێرگەیی

ڕۆژێک پیاوێک بۆ داربڕین چووە دارستان، هەندێک داری بڕی‌و پاشان بۆ پشوودانێک لەسەر قەدی دارێک دانیشت.

ورچێک هاتە لای‌و گوتی:

- کابرا وەرە با زۆرانبازییەک بکەین.

پیاوەکە تەماشایەکی ورچەکەی کردو لە دڵی خۆیدا گوتی: چۆن من دەتوانم زۆرانبازیی لەگەڵ ئەم دڕندە ترسناکەدا بکەم؟! بە یەک لێدان دەمکات بە جەستەیەکی بێگیان.

پیاوەکە هاتە قسەو بە ورچەکەی گوت:

-من زۆرانبازیی دەکەم لەگەڵتدا! بەڵام با یەکەمجار بزانین تۆ ئەو هێزەت هەیە، کە من زۆرانبازیت لەگەڵدا بکەم، ئینجا بڕیار دەدەین کە ئایا زۆرانبازیی بکەین، یان نا.

ورچەکە پرسیاری کرد:

-ئەمە چۆن دەکرێت؟

پیاوەکە تەورداسێکی هێناو درزو قڵیشێکی لە قەدی دارەکە کرد، ئینجا مێخو سنگێکی خستە نێوانی قڵیشەکەو تێیدا چەسپاندو بە ورچەکەی گوت:

-ئەگەر بە چڕنووکەکانت ئەم قەدە دارەت پارچەکرد، ئەوە مانای ئەوەیە کە تۆ بەهێزیتو زۆرانبازییەکە دەکەین.

بەمشێوەیە ورچەکە زۆر بیری نەکردەوەو یەکسەر چڕنووکەکانی خستەناو قڵیشی قەدەکەوە، کە هەوڵبدات پارچەی بکات. لەم کاتەشدا پیاوەکە بە لێدانێک سینگەکەی ناو قڵیشەکەی لاداو کە سینگەکە هاتە دەرەوەو چڕنووکەکانی ورچەکە لە ناو قڵیشی دارەکە گیربوون.

ورچەکە هاواری کردو لەبەر ئازار هەر هەڵدەپەڕی، بەڵام نەیدەتوانی نە قەدی دارەکە پارچە بکاتو نە لەوێش ڕابکات.

-پیاوەکە بە ورچەکەی گوت: ئێستا ڕات چییە؟ زۆرانبازییم لەگەڵدا دەکەیت؟

ورچەکە گوتی: نا.... من زۆرانبازی لەگەڵ تۆدا ناکەم!

پیاوەکە گوتی:

-ئەوە ڕاستە کە تەنها بەهێزی بازوو ناتوانرێت جەنگو زۆرانبازیی بکرێت، بەڵکو بە ئەقڵو ژیرییش دەتوانرێت.

ئیتر پیاوەکە سنگەکەی هێنایەوەو خستییەوە قڵیشی قەدەکە، بە شێوەیەک کە ورچەکە توانی چڕنووکەکانی ڕابکێشێتە دەرەوە، ئینجا ورچەکە بە خێرایی هەڵاتو دارستانەکەی جێهێشت.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربی الصغیر) ٢٠١٠



ئازا یوسف

# تووتی‌و لە خۆبایی

تووتی پەڕوباڵی زۆر جوانو قەشەنگ بوو، ڕەنگی باڵەکانی سەرنجی تەواوی باڵندەکانی تری ڕاکێشابوو، بەڵام تەواو لە خۆبایی بوو، کاتێك هەڵئەفڕی و باڵەکانی لێك دەکردەوە ئەوەندەی تر لە خۆبایی دەبوو، لانەکەی دوور لە هاو باڵندەکانی تر ساز کردبوو، هەمیشە ڕووی لە خۆیی‌و پشتی لەوان بوو، هەرگیز یاری لەگەڵیاندا نەدەکرد، گوایە لە نێو هەموو باڵندەکان خۆی جوانترەو لە سەرووی هەمووانەوەیە، ڕۆژێکیان لە پڕێکا (با) هەڵیکرد، تووتی لە خۆبایی کەوتە نێو ڕەشەباوەو لولی دا، تووتی کەوتە هاوارکردنی باڵندەکانی تر، فریامکەون، ڕەشەبا فڕێیدایە نێو ڕووبارێکەوە، هیچ کام لە باڵندەکان نەیانتوانی ڕزگاری بکەن، پاشان خۆی بە لقی درەختێکەوە گرتەوە، هەر کە هاتە دەرەوە سەیری خۆی کرد لە ئاوەکەدا، بینی هیچ لە پەڕەمووچەکانی لاشەی نەماوە باڵندەکانی تر هەر کە ئەمەیان بینی دایانە قاقای پێکەنین. تووتی لەخۆباییەکە سەری دانەواندو داوای هاوکاری لە باڵندەکانیتر کردو وتی: بەڵێن بێت جارێکیتر لە خۆم بایی نەبم، من هەڵە بووم. ئیتر با پەند وەرگرین لە چیرۆکەکەمان، تووشی لە خۆبایی بوون نەبین، دەنا وەك توتییەکەمان بەسەر دێت.

# بازاڕسازی ئەلیکترۆنی




ئا: ئیبراهیم مستەفا خدر

لە ڕاستیدا بازاڕسازی ئینتەرنێتی تەکنیکی سوود وەرگرتنە لە ڕیکلام لە وێب سایتەکان، ئەویش بە شێوازە جۆراوجۆرەکانیو لە هەمان کاتدا تەکنیکو هونەری دابەشکردنو گەیاندنی زانیارییە بۆ بەڕێوەبەرانی فرۆشتنی شتومەکو خزمەتگوزاری لە ڕێگای ئینتەرنێت.

هۆکارە سەرەکییەکان بۆ بەڕێوەبردنی ئینتەرنێتی بریتییە لە:

١- ڕیزبەندی وێب سایتەکانی گەڕان.

٢- ڕیکلامو بانگەوازی ئینتەرنێتی.

٣- فراوانکردنی زانیارییەکان.

بەڕێوەبردنی گەشەکردنی خاڵی فرۆشتن بە هۆی بازاڕسازی ئەلیکترۆنی بریتییە لە فراوانکردنی بازنەی چالاکی ڕێکخراو بە هۆی ناوبانگی شتومەك، یان خزمەتگوزاری وەك باشترین هەڵبژاردنی بازاڕی بازرگانی بە هۆی بەشداربوون لە تەواوی خاڵو شوێنە پێویستەکان بە مەبەستی پەیوەندیکردن لەگەڵ کڕیاری ئامانج. ئەم کارە بە دۆزینەوەو ناسینەوەو تەرکیزو گرنگیدان لەسەر ئەو شوێنو خاڵە گرنگانە، وەك کەناڵی سەرەکی بازاڕسازیو دۆزینەوەی بازاڕ دەستەبەر دەکرێت کە توانای ئەوە بە ئێوە دەبەخشێت کە وێب سایتی کۆمپانیاکەتان ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کۆمەڵگای بە ئامانجکراو بکات. بە شێوەیەکی کورت بازاڕسازی ئەلیکترۆنی سەبارەت بە دروستکردنی کەناڵەکانی بازاڕسازی بۆ کڕیارەکانی ڕێکخراو ئەو توانایەی هەیە کە بە خێرایی شت لێك بداتەوەو ڕاپۆرتی لێ دروست بکات.

دەتوانرێت بەم شێوەی خوارەوە پێناسەی بازاڕسازی ئینتەرنێتی بکرێت:

گەیشتن بە ئامانجەکانی بازاڕسازی بە هۆی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای پەیوەندی ئەلیکترۆنی، کە ئەم تەکنەلۆژیایە ئینتەرنێت، پۆستی ئەلیکترۆنیك، کتێبەکانی ئەلیکترۆنی، بانکەکانی زانیاریو مۆبایل دەگرێتەوە.

بازاڕسازی بەڕێوەبردنی بابەتێکە کە ئەرکی ناسینەوەی شتومەکو خزمەتگوزاری، پێشبینی کردنی بازاڕو دەستەبەرکردنی ڕەزامەندی کڕیارەکان بە بەراورد بە وەرگرتنی ئەنجامی کاریگەر بەرامبەر بە پێداویستییەکان لە ئەستۆ دەگرێت. لە پێناسەی سەرەوە خاڵی سەرەکی جەخت لە بازاڕسازی لەسەر کڕیارەکان دەکاتەوە.

-- تەکنەلۆژیای ئینتەرنێت دەتوانێت بۆ پشتگیری کردن لەم ئامانجانەی خوارەوە بەکار بهێنرێت:

١- ناسینەوە: ئینتەرنێت دەتوانێت بۆ توێژینەوەی بازاڕسازی لە ڕاستی ناسینەوەی پێداویستیو داواکاری کڕیارەکان سوودی لێ وەربگیرێت.

٢- پێشبینی کردن: ئینتەرنێت دەروازەیەك پێکدێنێت کە بە هۆیەوە کڕیارەکان دەتوانن سوود لە زانیارییەکان وەربگرنو شتومەك بکڕن. زانینی داواکاری کڕیار دەتوانێت کلیلێك بێت بۆ کۆنترۆڵکردنی سەرچاوەکانی بازاڕسازی ئەلیکترۆنی.

٣- بەدەستهێنانی ڕەزامەندی کڕیار: ئەویش یەکێك لە هۆکارەکانی سەرەکی سەرکەوتن لە بازاڕسازی ئەلیکترۆنییە کە دەبێتە هۆی ڕاکێشانی ڕەزامەندی کڕیار بە هۆی کەناڵەکانی ئەلیکترۆنی.

(Chaffey و Smith) ڕێگەچارەیەك پێشنیار دەکەن سەبارەت بەوەی کە چۆن ئینتەرنێت دەتوانێت بۆ تەکنیکە جیاوازەکانی بازاڕسازی سوودی لێ وەربگیرێتو بەکاربهێنرێت، ئەو ڕێگەچارەیە (5s)ە. بۆ نموونە بۆ گۆڤارێکی ئینتەرنێتی ئەو تەکنیکە بریتییە لە:

١- فرۆشتن: (Sell)

بەرزکردنەوەی ڕێژەی فرۆشراوەکان، گۆڤاری ئینتەرنێتی دەتوانێت لە دوو لایەن ڕۆڵی هەبێت، یەکەمیان دەتوانێت پارێزگاری لە کڕیارەکان بکاتو دووەمیان دەتوانێت بنچینەی فێربوونی زانیاری نوێ بۆ کڕیارەکان دەستەبەر بکات، گۆڤاری ئینتەرنێتی (lastminute.com) هەردوو ڕۆڵی سەرەوە لە خۆ دەگرێت.

٢- گەیاندنی خزمەتگوزاری: (Service)

واتە بەهای زیاتر بە کڕیارەکانی خۆتان سوودی زیاتر دەبێت وەك خستنەڕووی پێشنیارێکی خەیاڵی، یان پێدانی زانیاری ورد سەبارەت بە بەرهەمەکانتان.

٣- گفتوگۆکردن: (Speak)

دروستکردنی پەیوەندییەکی نزیك

لەگەڵ کڕیارەکان بە هۆی گفتوگۆکردنی هاوبەش، پرسیارکردنو هەر بیرۆکەیەکی تر کە بە پێویستی دەزانن و هەست دەکەن کە خەڵك ئارەزوویەتی.

٤- پاشەکەوت: (Save)

کەمکردنی تێچوونەکان، ئەگەر ئێوە گۆڤاری خۆتان بە شێوەی ئاساییو لەسەر لاپەڕە بۆ کڕیارەکان دەنێرن بە هۆی دەستەبەرکردنو خستنەڕووی گۆڤاری ئەلیکترۆنی بەو کڕیارانە کە ناردنی ئاسایی گۆڤار بۆیان سەختو دژوارە تێچوونەکانی خۆتان بە ڕادەیەکی بەرچاو کەم بکەنەوە.

٥- Sizzle:

واتە گەشەپێدانە بە ناوی بازرگانی ئۆن لاین. گۆڤارێك کە ناوی بازرگانی ئێوە لە مێشکی کۆمەڵگا دەکاتەوەو یارمەتیدەرە بۆ بەهێزکردنی ناوی بازرگانی ئێوە.

بازاڕسازی تایبەت: (Personal Marketing)

بازاڕسازی تایبەت، یان کەسێتی کە هەندێجار پێیدەوترێت بازاڕسازی کەس بۆ کەس، جیاوازییەکی یەکجار زۆری هەیە لەگەڵ جیاوازبوونی بەرهەمەکان، چونکە جیاوازبوونی بەرهەم هەوڵ دەدات بەرهەمەکانی جیاوازتر لەوەی کە ڕکابەران بەرهەمی دەهێنن پێشکەش بە بازاڕ بکات، بەڵام بازاڕسازی تایبەت هەوڵ دەدات تاوەکو شتومەکێکی دیاریکراو بۆ هەریەك لە کڕیارەکان دابین بکات.

بازاڕسازی تایبەت زۆرترین بەکارهێنانی هەیە لە ئینتەرنێت. وێب سایتێك کە دەتوانێت ئارەزووی بەکارهێنەر بدۆزێتەوەو بۆ داهاتوو پێشنیارێکی تایبەت بخرێتە بەردەم بەکارهێنەر، ئەمڕۆ زۆر وێب سایت هەیە کە ئەم توانایەی بۆ کڕیارەکانی دەستەبەر کردووە کە بە هۆی زنجیرە زانیارییەکی ڕێکخستراو شتومەکێکی دیاریکراو بۆ هەر کڕیارێك دەستنیشان دەکات.

بازاڕسازی بەرۆخسەتەوە: (Permission Marketing)

زاراوەیەك کە لە بازاڕسازی ئەلیکترۆنی زۆر بەکار دەهێنرێت بەم شێوەیە دۆزەرەوەی بازاڕەکان پێش ئەوەی کە ڕیکلامی خۆیان بۆ کڕیار بنێرن رووخسەت لە کڕیار وەردەگرن. ئەم شێوازە لە لایەن دۆزەرەوەی بازاڕی ئینتەرنێتی، ئیمێڵو مۆبایلی بەکار دەبرێت کە لێرە دەبێت خەڵك لە سەرەتادا ئەم شێوازە هەڵبژێرن.

**بازرگانی ئەلیکترۆنی:**

بازرگانی ئەلیکترۆنی بریتییە لە کرداری کڕینو فرۆشتن، بازاڕسازیو خزمەتگوزاری بەرهەمو خزمەتگوزارییەکان لەسەر تۆڕەکانی کۆمپیوتەر. بازرگانی ئەلیکترۆنی یەکێك لە هۆکارەکانی پیشەو کاری ئەلیکترۆنییە. بازرگانی ئەلیکترۆنی ڕابەرو ڕێنمایی پەیوەندییەکانی کارو بەڕێوەبردن بە هۆی شێوازەکانی ئەلیکترۆنییە وەك گۆڕینەوەی ئەلیکترۆنی داتاکانو سیستەمەکانی ئۆتۆماتیکی کۆکردنەوەی داتاکان، هەروەها بازرگانی ئەلیکترۆنی پەیوەندی هەیە بە گواستنەوەی ئەلیکترۆنی داتاکان لە نێوان پیاوانی پیشەو کار.

**مێژووی گەشەسەندنی بازرگانی ئەلیکترۆنی:**

واتای زاراوەی بازرگانی ئەلیکترۆنی بە درێژایی ساڵەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە، سەرەتا بازرگانی ئەلیکترۆنی بە مەبەستی ئاسانکاری لە شێوەی تەکنەلۆژیا وەك گۆڕینو گواستنەوەی ئەلیکترۆنی داتاکان سەری هەڵدا کە دەکرێت ئاماژە بە ناردنی بەڵگەنامەکانی بازرگانی، داواکاریو فاتورەکان بکرێت، بەڵام ئەمڕۆ بازرگانی ئەلیکترۆنی واتای بەرفراوانتری هەیە کەوا باشترە بە "بازرگانی وێبی" ناو ببرێت. کڕینو فرۆشتنی شتومەك لەسەر وێبەکانی ئینتەرنێتی بە هۆی کەناڵە پاراستراوەکانو بەکارهێنانی کارتەکانی ئەلیکترۆنی تەنیا بەشێك لە تەکنەلۆژیاو گۆڕانکاری دروستکراو لە بازرگانی ئەلیکترۆنییە.

**هۆکارە سەرەکییەکانی سەرکەوتن لە بازرگانی ئەلیکترۆنیدا:**

١- ڕێزلێنانو دانانی بەها بۆ کڕیارەکان:

ئەم کارە دەتوانرێت بە پێشکەشکردنو خستنەڕووی بەرهەمێکی سەرنجڕاکێش کە لە بازاڕی ڕکابەریش بەرچاو بێت ئەنجام بدرێت.

٢- پێشکەشکردنو بەرهەمهێنانی خزمەتگوزارییەکی نایاب.

٣- هەوڵدانو هاندانی کڕیار بۆ کڕینو دووبارە گەڕانەوە بۆ سایت:

ئەم کارە دەکرێت بە هۆی داشکاندن، پرۆگرامەکانی تایبەت بە ڕیکلامو... هتد، ئەنجام بدرێت.

٤- ئامادەکردنی سایتێکی سەرنجڕاکێش:

بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت وردەکاری پێویست لە بەکارهێنانی ڕەنگ، وێنە، فایلەکانی گرافیکی، وێنە جوڵاوەکانو... هتد، ڕەچاو بکرێت.

٥- دروستکردنی ئەنجوومەنەکانی خەیاڵی:

ئەم کارەش دەکرێت بە هۆی ژوورەکانی چات کردن، بەشی ناردنی بیروڕاکانو... ئەنجام بدرێت.

٦- دروستکردنی متمانەو پاراستن:

ئەم کارەش بە هۆی شاردنەوەی زانیاری، دیواری ئاگرینو بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای بەهێز ئەنجام بدرێت.

٧- گرنگیدان بە پەیوەندیکردن لەگەڵ کڕیارەکان:

بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت دڵنیابن کە تەواوی کارمەندان، بەڕێوەبەرانو هاوپەیمانەکانی کاری بازرگانیتان بە هەمان شێوە وەك ئێوە بیر بکەنەوە.

٨- خودی کڕیارەکان سەرچاوەیەکی گرنگن بۆ ئەزموونو تاقیکردنەوەی جۆراوجۆر، ئێوە دەتوانن لە ڕێگای هەریەك لە ئیمێڵەکان، ڕەخنەو بیروباوەڕەکانیان ئەزموونێکی بە نرخو بێ بەرامبەر بەدەست بهێنین.

٩- ساکاریو کاریگەری کرداری کارو پیشەکان:

ئەم هەنگاوەش دەکرێت لە ڕێگای ئەندازیاریو بەکارهێنانی هۆکارەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری ئەنجام بدرێت.

١٠- دەرفەتێك بۆ کڕیارەکان بڕەخسێنن بۆ ئەوەی یارمەتی یەکتر بدەن، ئەم کارە دەکرێت بە دروستکردنی وێب سایتێکی سەربەخۆ بە بێ پێداچوونەوە ئەنجام بدرێت.

١١- یارمەتی کڕیارەکان بدەن تاکو بتوانن کاری خۆیان ئەنجام بدەن:

ئەویش لە ڕێگای بەردەستبوونی زانیارییەکانو توانای بەراوردکردنیان لەگەڵ توانای گەڕان بە شێوەی گونجاو ئەنجام دەدرێت.

١٢- هەوڵ بدەن پلانێکی سەرەکیو بێ گرفتو کێشە بۆ کاری بازرگانی پێناسە بکەن.

١٣- ڕێکخراوی خۆتان هەمیشە لە حاڵەتی ئاگاداریو وریابوون دابنێنو هەمیشە ئامادەبن تاوەکو هەر گۆڕانکارییەك رووبدات بە خێرایی کاردانەوەتان هەبێت.

# دۆزینەوەی پێداویستییەکانو پڕکردنەوەی

بەشی شەشەمو کۆتایی

هاژە شێروانی

لە بازاڕێکدا کە ڕکابەری تیایدا بە ئاستێکی زۆر بەرز بێت، ئەوا پێویست دەکات کە هەموو کارگێڕییەکان تیشک بخەنە سەر هەڵبژاردنی کڕیار، هەروەك (جاك ویلش) سەرۆکی جێبەجێکاری کۆمپانیای جەنەراڵ ئەلیکتریك بە فەرمانبەرانی دەڵێت: «کۆمپانیا ناتوانێت کە ئاسایشی کار بدات، بەڵکو کڕیارەکانن کە ئەم کارە دەکەن»، ئەوە وادەکات کە فەرمانبەرانی لەوپەڕی بە ئاگاییدابن لە کاریگەرییان لەسەر ڕەزامەندی کڕیارەکانیانو پارێزگاری لێکردنیان. بە بێ ڕوانین لە کارگێڕییەکانیان. ئەمەش بە واتای: ئەگەر بیرت لە کڕیار نەکردەوە، ئەوا تۆ بیرناکەیتەوە. هەر لێرەوەو لەم بەشی شەشەمو کۆتایی ئەم زنجیرەیەدا کە وەرگیراوە لە پەرتووکی (کوتلر یتحدث عن التسویق) هەوڵماندا کە چەند بەشێکی گرنگو پوختی ئەم پەرتووکە بخەینە بەر دیدی ئێوەی خوێنەری بەڕێز، بە هیوای سوودمەندیتانو بە پشتیوانی خوای گەورە چاوەڕوان بن بۆ بلاّوکردنەوەی ئەم پەرتووکە بە زمانی شیرینی کوردی لە داهاتوودا.

کۆتلەر لەم بەشەیدا دەڵێت: کە نرخدانان، یا بەهادان بەوەی کە کام لە کارگێڕییەکانی کۆمپانیا بیر لە کڕیار دەکاتەوە، ئەوانەی کە خاوەن عەقڵییەتی مەیلدارن بەرەو کڕیار، بریتین لەم کارگێڕییانەی خوارەوە:

**کارگێڕی توێژینەوەو پەرەپێدان (R& D):**

* هەندێك کات بەسەر دەبەن لە چاوپێکەوتنی کڕیارەکانیانو گوێگرتن لە گرفتەکانیان.

* خۆشحاڵن بە بەشداری کارگێڕی بازاڕسازیو بەرهەمهێنانو کارگێڕییەکانی تر لە هەر پرۆژەیەکی نوێدا.

* دیراسەتکردنی بەرهەمی ڕکابەرانو کۆششکردن بۆ چارەسەری کۆمپانیا «پێگە بەرزەکان» best of class.

* ڕاکێشانی کاردانەوەی کڕیارەکانو پێشنیارەکانیان لە کاتی پێشکەوتنی پرۆژە.

* پەرەپێدان بە بەرهەمو باشترکردنی بە بەردەوامی، ئەمەش بە پشت بەستن بەم تەکنیکەی کە لە بازاڕدا هەیە.

**کارگێڕی فرۆشراوەکان:**

* گەڕان بە شێوازێکی ئەرێنی بە دوای باشترین دابینکارانی لە بری هەڵبژاردن لە نێوان ئەوانەی کە بانگەشە بۆ کارەکانیان دەکەن.

* بەستنی پەیوەندی درێژخایەن لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە دابینکاران کە خاوەن کوالێتییەکی بەرزنو دەتوانرێت پشتیان پێ ببەسترێت.

* کوالێتی بەرهەم یەکسان ناکەن بە نرخ.

**کارگێڕی بەرهەمهێنان:**

* بانگێشتی کڕیارەکانیان دەکەن بۆ سەردانی بینای کارگە، کۆمپانیاو بە ناویدا دەسوڕێنەوە.

* سەردانی بیناو کارگەکانی کڕیارەکانیان دەکەن بۆئەوەی ببینن کە چۆن بەرهەمەکانیان بەکاردەهێنن.

* خۆبەخشن لە هەڵسانیان بە کاری زیاتر کاتێك کە خشتەی وەرگرتنی واژۆکراو جێبەجێکردنەکەی نزیك بۆتەوە.

* بە بەردەوام دەگەڕێن بە دوای بەرهەمهێنانی کاڵاکانیان بە ڕێگایەکی خێرا، یان بە کەمترین تێچوون.

* هەڵسان بە پەرەپێدان بە کوالێتی بەرهەم بە بەردەوامی، کە ئامانجیان لێی نەهێشتنی هیچ خەوشێکە تیایدا.

* داواکارییەکانی کڕیار پڕدەکەنەوە لە دیزاینکردنی بەرهەم بە گوێرەی داواکارییەکانی کڕیار Customization هەر کاتێك کە قازانجدار بێت بۆ کۆمپانیا.

**کارگێڕی بازاڕسازی:**

* هەڵدەستن بە دیراسەتکردنی پێداویستیو ئارەزووەکانی کڕیار لە بەشە دیاریکراوەکانی بازاڕ بە باشی.

* کۆششێکی بازاڕسازی دەکەن سەبارەت بە ئەگەری قازانج لە ماوەیەکی درێژخایەن بۆ بەشە بە ئامانجکراوەکانی بازاڕ.

* بیرکردنەوە لە خستنەرووی قازانجدار بۆ هەر بەشێکی بە ئامانجکراو.

* هەڵدەستن بە پێوانەکردنی سیمای کۆمپانیاو ڕەزامەندی کڕیار بە بەردەوامی.

* بە بەردەوام بیرۆکەی بەرهەمی نوێ کۆدەکەنەوەو دایدەرێژن لە پاڵ باشترکردنیو خزمەتکردن بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی کڕیارەکانیان.

* کاریگەری دەخەنە سەر هەموو کارگێڕییەکانی کۆمپانیاو فەرمانبەرەکانیان، بۆئەوەی بیرکردنەوەیانو کارەکانیان لە تیشك خستنە سەر کڕیار بێت.

**کارگێڕی فرۆشیاری:**

* زانیارییان هەیە تایبەت بەم پیشەسازییەی کە خزمەتی کڕیار دەکات Customers Industry.

* هەوڵدەدەن باشترین چارەسەر بۆ گرفتەکانی کڕیار پێشکەش بکەن.

* تەنها بەڵێن بەوە دەدەن کە دەتوانن جێبەجێی بکەن.

* پێداویستییەکانی کڕیارو بیرۆکەکانیان دەگوازنەوە بۆ لایەنی

پەیوەندیدار بە پەرەپێدانی بەرهەم.

* خزمەتی هەمان کریار دەکەن بۆ ماوەیەکی درێژتر.

کارگێری لۆجیستی، کارگێری خزمەت Logistics:

- ئاستێکی بەرز دادەنێن بۆ کاتی گەیشتنی خزمەتو بە جێگیری دەیهێڵنەوە.

- بەوپەری ماریفەتو ڕێزەوە کارگێری خزمەتی کریار بەڕێوە دەبەن کە دەتوانێت وەڵامی پرسیارەکانی کریار بداتەوەو مامەڵە لەگەڵ گلەییەکانیان بکاتو چارەسەری گرفتیان بکات بە ڕێگایەکی قبوڵکراو و کاتی گونجاو.

کارگێری ژمێریاری:

- بە شێوەی خول ڕاپۆرتی قازانجداری ئامادە دەکەنو بە گوێرەی بەرهەمو بەشەکانی بازاڕو فراوانی جوگرافی (هەرێمو ناوچەی فرۆشتن)و قەبارەی داواکاری و کەناڵەکان و کریارەکانی و تاکەکانی.

- لیستێك ئامادە دەکەن Invoices بە گوێرەی پێداویستییەکانی کریارەکانو وەڵامی پرسەکانیان دەدەنەوە بە خێرایی و بەوپەری ڕێزەوە.

کارگێری دارایی:

* لە چالاکییەکانی بازاڕساز تێدەگەنو پاڵپشتن بۆی (وەکو ڕیکلامکردن بۆ سیمای کۆمپانیا) کە ڕەنگدانەوەی وەبەرهێنانەکانی بازاڕسازییە کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ پێ باشترینەکانی کریارو مەیلی بۆ کۆمپانیا دەستەبەر دەکات.

* ئەم بۆندە ماددیانەیان پێباشە کە دەگونجێت لەگەڵ داواکاری دارایی کریارەکانیان.

* بڕیاری خێرا دەدەن سەبارەت بە مافی کریار لەسەر ئاسانکاریو قەرز.

کارگێری پەیوەندی گشتی:

* هەواڵی باشی کۆمپانیا بڵاودەکەنەوەو خراپەکانیشی دەشارنەوە.

* بەرگری لە کریاری ناوخۆییو جەماوەرەکەی دەکەن لە پێناو بە ئەنجامگەیاندنی باشتر بۆ سیاسەتەکانی کۆمپانیا.

فەرمانبەری تر مامەڵە لەگەڵ کریار دەکەن:

* کە دەبێت تواناداربن، خۆش گوفتاربن، ڕووخۆشبن، ڕاستگۆبن، پشتیان پێببەسترێتو بە دەنگ کریارەوە بچن.

# فۆرمی پڕۆژەی چاکسازی لە هەرێمی کوردستاندا

## ئازیزانو وڵاتپەروەران، دڵسۆزانی ئەم کوردستانە شیرینە:

ئەمڕۆ بێت، یا سبەی، هیچ ڕێگایەکمان لە بەرامبەردا نییە بۆ گۆڕانو چاکسازیو گەشەپێدانو پێشکەوتن جگە لە پلانو نەخشەو بەرنامەڕێژیو کارکردن بەپێی بەرنامەو پرۆگرامو پڕۆژەی دارێژراوو کاری بێ وچانو هەوڵو کۆششی بەردەوام.

ئەم فۆڕمەش شێوازێکە بۆ نووسینی ئەو پڕۆژانەی کە ئێوەی بەڕێز پێشنیاری دەکەنو ئێمەش دەیخەینە بەردەستی خوێنەران، تا دەگاتە لایەنی پەیوەندیدار تا لە ئایندەیەکی نزیکدا جێبەجێ بکرێت.

دەتوانن پڕۆژەکانتان بە شێوەی ئەم فۆڕمە بنووسنەوەو بەم ئیمەیڵە ڕەوانەی گۆڤاری بریاری بکەن... bryar@bryarmagazine.com

### فۆرمی پڕۆژەی چاکسازی لە هەرێمی کوردستاندا:

ناوی پرۆژە:

سنوری پرۆژە:

لایەنی پەیوەندیدار:

کاتی دیاریکراو بۆ جێبەجێکردن: (.......................................................)

پێناسەی پرۆژەکە لە چەند دێرێکدا:

..................................................................................

..................................................................................

..................................................................................

..................................................................................

سوودەکانی پرۆژە بە پێی ئاستەکان:

١- ئاستی کلتوری..........................

٢- ئاستی نەتەوەیی..........................

٣- ئاستی ئابوری..........................هتد

هەنگاوەکانی جێبەجێکردنی پرۆژە:

هەنگاوی (١)..........................

هەنگاوی (٢)..........................

هەنگاوی (٣)..........................

ناو:

ئاستی خوێندن:

پیشە:

مۆبایل:

ئیمەیڵ:

# چۆنێتی پەیوەندیکردن بە ژیری ناوەکیت!



چیا عبدالله

خوای گەورە مرۆڤی بە جیاوازیو تایبەتمەندی زۆرەوە دروستکردووە، یەکێك لەو تایبەتمەندییە گرنگانە کە جیای دەکاتەوە لە هەموو دروستکراوەکانی تر ژیرییە، ئەم نیعمەتەی کە پێی بەخشیوین ڕەهەندەکانی زۆر دوورودرێژو تولانین، مرۆڤ دوو جۆر ژیری هەیە، بە پێی لێکۆڵینەوەی زانایان، ئەویش ژیری دەرەکیو بە ئاگاو ژیری ناوەکی، لێرەدا بە کورتی تیشك دەخەینە سەر ژیری ناوەکی (العقل الباطن)و چۆنییەتی پەیوەندیکردن پێوەی..

مەبەست لە ژیری ناوەکی درك بە بارودۆخو دەرەوەی ئێمە نییە، بەڵکو تەنیا پەیوەستە بەو مەسجانەی کە ئێمە ئاڕاستەی دەکەین، ئەمەش گشتگیرە بە هەموو مرۆڤێکەوە، ئیتر ئەو کەسە ئەم ناوە، یا ئەم زانستەی بیستبێت، یانا، جاخۆشبەختی مرۆڤ لەوەدایە کە دەتوانێت بەرنامەڕێژی نەرێنی خۆی بگۆڕێت بۆ ئەرێنی، ئەویش لە ڕێی پەیوەندیکردنی بە ژیری ناوەکییەوە، ئەمەش خۆی بۆ خۆی هونەرو زانستێکە تۆ لە ڕێیەوە دەتوانیت سودی لێببینیت، ئەم خاڵانە زۆر بە کورتی باسیان دەکەین تۆ دەتوانیت پەیکەلیان بکەیت.

### چۆنییەتی پەیوەندیکردن بە ژیری ناوەکییەوە:

١- پێش پەیوەندی کردنت دەبێت ئامانجێکی ڕوونو سادە دیاری بکەیتو بەدەستەواژەی ئێستاش بێت، بۆ نموونە: (ئامانجت ئەوەیە متمانەت زیاتر بە خۆت هەبێت، یا زاڵ بیت بەسەر هەستو شعوری نەرێنیدا، یا بتەوێت خۆت ڕابهێنیت لەسەر خوێندنەوەی ڕۆژانە، یا ڕۆژانە وەرزش ئەنجام بدەیت...هتد)، ئێستا دەفتەرو پێنووسە تایبەتییەکەت بهێنەو بنووسە (من ئێستا متمانەم بە خۆم هەیە)، یا (من ئێستا هەست بە بەختەوەری دەکەم)، (من ئێستا خوێنەرێکی زۆر نایابم)، (تێبینی با لەم کاتەدا کتێبەکەت بە دەستەوە بێتو با هەستی بەرکەوتنیش بەشداربێت لەو هەستە خۆشەتدا)، نابێت دەستەواژەی ئایندە بەکار بهێنیت بە نموونە بڵێیت: (من کە ڕۆیشتمە دەرەوە هەست بە بەختەوەری دەکەم)، یا (من دوایی متمانەم بە خۆم دەبێت) ...هتد، نابێت دەستەواژەی (نا) بەکاربهێنیت، بۆ نموونە بڵێیت: (دڵتەنگ مەبە) ئەمە دەستەواژەی نەهییە، عەقڵی ناوەوەت مەبە کە دەسڕێتەوەو تەرکیز دەخاتە سەر دڵتەنگی. لە ژیانی ڕۆژانەماندا زۆر لەم وتانە دەبیستین سەری مانگ کە مووچە وەردەگریت دایکت پێت دەڵێت: توو ئەو خوایە مەچۆ لە بازاڕدا هەمووی داچێنە، (ڕێك تەرکیزی تۆی بەرەو ئەو بازاڕە برد کە لە یەك ڕۆژدا مووچەکەتی تیا بنەبڕ دەکەیت) لە زۆر بواری تری ژیانیشدا، تەنیا بە خوێندنەوەی ئەو دێڕە دەزانم عەقڵت چەندین شتی ڕابردووت بیر دێنیتەوەو بۆت ڕیز دەکات، کەواتە ئێستا با دەستەواژەکەت لەم چرکە ساتەدا بێت، (چونکە عەقڵی ناوەکیت حەزی لە زۆر لێکردنو پەستان نییە، شتی ڕوونو دیارو ئاشکرای دەوێت. تۆ نەزانیت چیت دەوێت ئیتر عەقڵت بەرەو کوێ ئاڕاستەت بکات... کەواتە ورد بە، ویستی خۆت بە ڕوونی ئاشکرا بکە بۆ عەقڵت.

٢- زۆر گرنگە ئەوەی کە دەتەوێت بینووسیت، چونکە زانایانی دەروونناسی جەخت لەوە دەکەنەوە کە نووسینی ئامانج نیوەی بە دەست هێنانییەتی لە ئێستاوە هەستە دەفتەرێکی زۆر جوانو تایبەت بە خۆت لەگەڵ قەڵەمێکی نایابدا بۆ خۆت بکڕەو بە دیاری بیبەخشە بە خۆت، تەنیا تایبەتی بکە بەشتە کەسییەکانی خۆتو با بەردەوام هاوڕێشت بێت ئەو شتانەی تیا بنووسە کە تۆ دەتەوێت یا کە هەستی بەختەوەری لای تۆ دروست دەکات، بۆ هەموو ئامانجێکیشت هۆکاری زۆرو بەهێزیش بنووسە بۆئەوەی پاڵنەرت بێت لە گەیشتنت بەو ئامانجەی کە دەتەوێت.

٣- لەبەرئەوە وتم با ئەو دەفتەرە بەردەوام هاوڕێت بێت بۆئەوەی بە بەردەوامی ئامانجەکەت بخوێنیتەوە لەگەڵ هۆکارەکانی دا کە مەبەست پێی بەرنامەڕێژی عەقڵی ناوەوەتە، چونکە بەم کارەت عەقڵی بە ئاگات ئاشنای دەبێت، پاشان دەیگەیەنێت بە عەقڵی ناوەوەت بە دووبارە کردنەوەی زۆریش عەقڵی ناوەوەت بەرنامەڕێژ دەبێت

(بەچی؟ بەوەی کە تۆ دەتەوێت نەك بەوەی کە بەرامبەرو کۆمەڵگەو ئەوانی تر دەیانەوێت، چونکە بەڕاستی دەوروبەرمان بەرنامەڕێژێکی زۆر بە توانان لە پڕکردنت لە نەرێنی... کەواتە فریای خۆت بکەوە باتۆش نەبیتە تاکێکی پڕ لە نەرێنیو تیشکی خۆری بەختەوەری نەبینیت.

٤- پەیوەندییەکی دروستیش بە عەقڵی ناوەوەت بە بەکارهێنانی ئەم چەند ڕێگایە دەبێت:

ا- بە تەواوەتی خاو بەرەوە: هەناسەدان بە قوڵی وات لێدەکات خاوبیتەوە، ئێستا ڕێگاکەیت پێ دەڵێم: (١- هەمیشە خۆت ڕابهێنە بە لوت هەناسە هەڵمژیت، ئێستا بە لوت هەناسەیەکی کورت هەڵمژە، پاشان ماوەیەکی کەم ئەو هەناسەیە بهێڵەرەوە دوای ئەوە هەناسەیەکی درێژ لە دەمتەوە بدەرەوە لەگەڵ ئەم هەناسە دانەوەیەدا ئیحا بە خۆت بدە کەخاو بیتەوە، واتە تەرکیز بخەرە سەر جەستەت لە ناخەوە بە خۆت بڵێ خاوبەرەوە) دوای ئەوەی کە هەستت کرد بە تەواوەتی خاوبویتەوە ئەو ئامانجانەی کە نووسیووتە بە خۆت بڵێرەوە کە مەبەستە بیگەیەنیتە عەقڵی ناوەوەت بە مەرجێکیش دەبێت هەستو شعورێکی پتەوو بەهێز لەگەڵ وتنەوەی دەستەواژەکانتدا بێت... وریا بە ئەمە بە یەکجار نابێت، دەبێت زۆر دووبارەی بکەیتەوە.. واتە لەم دنیا پڕ لە جەنجاڵییەداو ئەو جەستە ماندووەت پێویستی بەڕاهێنانە لەبەرئەوە (خير الامور ادومها ولو قل) گەشبین بە دەتوانیت خاوبببیتەوەو خۆشت بەرنامە ڕێژ بکەیت.

ب- خەیاڵی داهێنانکارانە: ئەم خەیاڵە مەبەست پێی ئەوەیە وابیر بکەیتەوە کە تۆ ئامانجەکەت بەدی هێناوە بە هەستو شعورێکی پتەوەوە، ئەمەش لە کاتی ڕاهێنانی خاوبوونەوەکەدا دەبێت.

دەتوانین لە ڕێی پەیوەندیکردن بە عەقڵی ناوەوەمانەوە شتی زۆر ئەنجام بدەین، بەشێوەیەکی زۆر نایاب ژیانی مرۆڤ دەگۆڕێت.. ئەمەش پەیامێکە ئاڕاستەی تۆی ئازیزی دەکەم بۆ ئەوەی سوود لەو هێزە ناوازەو بەخششە گەورەی خودا ببینیت.

ئەمەش واتای ئەوەیە گەنجینەی ڕاستەقینە لە ناخی خۆماندایە، بۆچی لە دەرەوە بۆی بگەڕێین؟!

ئەویش عەقڵی ناوەوەیە کە خاوەنی وزەیەکی زۆرو پڕ بەرهەمە، دەتوانین بەوە بەرنامەڕێژی بکەین کە دەمانەوێت ئەویش بۆ خۆی دەست بەکارەکانی سەرشانی دەکات.

ئا: پشتیوان مەحمود

# ژیانمان بەرهەمی بیرکردنەوەکانمانە

بیرکردنەوە: ئەوپرۆسە گرنگەیە کە بەشێکی گەورەی ژیانو ئایندەو ئێستامانی لەسەر بەندەو حوکمڕانو بڕیاردەری چارەنوسمانەو بەشدارە لە دروستکردنو بیناکردنی ژیانماندا، ژیانمان بەرهەمی ئەندێشەو بیرکردنەوەکانمانە، لەم سۆنگەیەوە دەکرێت بڵێین:

(ئەگەر بیرکردنەوەکانمان بگۆڕین ژیانیشمان دەگۆڕین)، زاناکانیش دەڵێن: ڕەفتار بەشێك لە تێڕوانینمانە، واتە کۆی ڕەفتاروهەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەرهەمی دیدگاو بیرکردنەوەو بۆچوونەکانییەتی.

بێگومان ئەو کەسەی بە شێوەیەکی دروست بیردەکاتەوە، دەزانێت ئامانجەکانی چینو بە کوێی دەگەیەنن، کاتێکیش دەگاتە شوێنی مەبەست لەوێوە ئاسۆیەکی ڕوونترو دوورتر دەبینێت.

تۆ ئەی (مرۆڤ) گەورەترین بوونەوەری خودای گەورەی کەزەویو ئاسمانوسەرجەم بوونەوەرانی تر بۆ خزمەتی تۆ دەستەمۆکراونو هێزی ژیریو عەقڵوبیرکردنەوەو هۆکارەکانی زانست لە بینینو بیستنو دڵ، گەورەترین خەڵاتی پەروەردگارە بۆ تۆ، تاکە دروستکراوێکی کە توانای بە دەستهێنانی ئامانجەکانت هەبێتو توانای چاکسازیت تێدا خولقابێت، بیرکردنەوە:

ژیانی مرۆڤ دروست دەکات، حەکیمو فەیلەسوفی ناوداری یۆنان (سوکرات) لە بارەی بیرکردنەوەوە دەڵێت: (بە بیرکردنەوە مرۆڤ دەتوانێت ژیانی خۆی بکاتە گوڵوگوڵزار، یان دڕكو داڵ)!

ئایا بڕوات وانییە کەشکستخواردووەکان بە شکستخواردوویی بیریان کردووەتەوەو سەرکەوتووەکانیش بیریان لەسەرکەوتن کردووەتەوەو سەرکەوتوانەش بیریان کردووەتەوە؟

بێگومان زۆرێك لە شتەکانی ژیانمان پەیوەستە بە بیرکردنەوەکانمانەوە، ئەگەرتا ئێستا بڕوات لاوازە گرفت نییە، بە ئەرك نەبێت چاوت داخەو بیر لە خواردنی لیمۆ بکەرەوە!

ئا... ئێستا دەمت پڕ بوو لە ئاو... وانییە؟ کەواتە بۆت دەرکەوت بیرکردنەوە چەند کاریگەرە.

**لە کۆتاییدا پێویستە بڵێین:**

ئاگاداری بیرکرنەوەکانت بە، چونکە دەبێتە قسەوگوفتار، هەروەها ئاگاداری قسەوگوفتارت بە، چونکە دەبێتە کردەوەو ڕەفتار، ئاگاداری کردەوەو ڕەفتاریشت بە، چونکە دەبێتە کەسێتیت، ئاگاداری ئەوەبە تۆ کێیت؟ چونکە پاشەڕۆژتی لەسەر بەندە. پاشەڕۆژت بە بیرکردنەوەکانت دەست پێدەکات، کەواتە باش ئاگاداری بیرکردنەوەکانت بە!

هەربیرکردنەوەیە جیهانو بوونو گەردوونی بەم ڕۆژگارو قۆناغەی ئێستا گەیاندووە.

جا باش بێت، یان خراپ.

# بۆئەوەی شادو خۆشحاڵ بیت، لە خۆت خۆشبە

ئا: دونیا موحسین فاتیح

زۆربەی خەڵکی کاتێك خۆشحاڵ دەبن کە بارودۆخی داراییان باش بێت، بەڵام شادیو خۆشحاڵی هەستێکە کە پەیوەندییەکی کەمی بە بارودۆخی داراییەوە هەیە، بۆ نموونە خۆشحاڵی لەگەڵ دەوڵەمەندی، ئەم دوو وشەیە جیاوازییەکی زۆریان لە نێواندا هەیە. لە ڕاستیدا هەستێکە کە بە ویستی ئێمە ڕۆشنو خامۆش دەبێت، بە هەندێ شت دەتوانین شادیو خۆشحاڵی بە دەست بهێنین، لەوانەیە ئەو شتانەی بە دەستی دەهێنین، ئەو تواناو هێزەی کە تیاماندایە، دوورکەوتنەوە لە ڕۆژانی دەردو ڕەنجو لەبیر کردنیان، بەمجۆرە دەتوانین هەمووکات لە دەروونی خۆتدا هەست بە شادیو خۆشحاڵی بکەیت، بە ئەنجامدانی ئەم کارانەش دەتوانیت هەست بە دڵخۆشی بکەیت.

١- دان بە هەڵەکانتدا بنێ: کاتێك هەڵەیەك ئەنجام دەدەیتو لەوە دەترسیت کە خەڵکی بە چاوێکی ناشیرینەوە تەماشات بکەن، بۆیە بەشاردنەوەو دان پێدانانیان تووشی خەمۆکی دەبیت، لە ڕاستیدا ئەوەی وا لە خەڵکی دەکات تەماشایەکی ناشرینیان لەسەرمان هەبێت ئەوەیە دان بە هەڵکانماندا نەنێین، دانپێدانانی هەڵەکان زۆربەی کات نیشانەی ئەوەیە کە بە دوای چارەسەرکردنیاندا دەگەڕێیت.

٢- لە خۆتان ببورن: یەکێك لەو شتانەی کە ڕێگەمان لێدەگرێت بۆ گەیشتن بە دڵخۆشی ئەوەیە کە لە خۆمان نەبوورین، ئەگەر کەماڵو جوانیمان هەبێت، ئەو هەڵانەی کە تووشی دەبین کاردانەوەیەکی خراپی لەسەر دەروونمان دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێك لە ژیانیدا بێ هەڵە نەبووە.

٣- هەڵەکانتان پاك بکەنەوە: ئەگەر تا ئێستا هەڵەکانتان پاك نەکردووەتەوە، هێشتا کاتتان هەیەو درەنگ نەبووە، ئێوە سەرۆکی بیرو هزری خۆتانن دەتوانن هەست بکەن، بۆ قەرەبوو کردنەوەیان هەوڵبدەن، ڕاستە ناتوانرێت ڕووداوەکان پێشبینی بکرێت، بەڵام دەتوانرێت هەستی خۆتان کۆنتڕۆڵ بکەن بەرامبەریان، لە نێوان یەکسانیو شڵەژاندا یەکێك هەڵبژێرین.

٤- وێناکانی ناو مێشکتان بەکاربهێنن: هەبوونی وێنەیەکی جوان و خۆش لە ناو بیرماندا دەتوانێت زاڵبێت بەسەر بیرکردنەوە ناخۆشو ناشیرینەکانماندا، کەواتە بیرکردنەوە خۆشەکان دەتوانێت هەستێکی خۆشمان پێ ببەخشێت.

٥- باوەڕمان هەبێت: بۆچی دەبێت بە نائومێدی خۆمان بدەینە دەستەوە، کاتێك سروشت هەمیشە پەیامی ئومێدەواریمان پێ دەدات، بە جۆرێکیش کە دەتوانین ئەو شتانەی دەمانەوێت بە دەست بهێنین. هەموومان لە ژیانی ڕۆژانەماندا تووشی ڕێگەی داخراو دەبین، بەڵام ئەوانە ڕێگرنین لە پێشکەوتنمان، باوەڕکردن بەوەی کە دەتوانین ڕۆژێکی پڕ لە خۆشیمان هەبێت، ئەوە خۆی لەخۆیدا دڵخۆشییە.

٦- بیر لە ڕێگەیەکی تر بکەرەوە: کاتێك سروشت بە دڵی ئێوە ناڕواتە پێش، کەمێك ڕاوەستەو بیر بکەرەوەو بزانە ئەو ڕێگایە بەرەو کوێت دەبات. گرنگترین شت بۆ شادی خۆشحاڵی هەڵبژاردنی ڕێگەیەکی ڕاستە، لەگەڵ ئەوەشدا ڕووداوەکان پێشبینی ناکرێن.

٧- کێشەکان بە هەل بزانە: زۆربەی نەخۆشەکان باوەڕیان وایە کە نەخۆشییەکەیان بۆیانی سەلماندووە کە ژیان زۆر لەوە بەنرخترەو بووەتە هۆی گۆڕانکاری زۆر گەورەو باش، دەتوانین لەمەوە بۆمان دەربکەوێت کە هەندێجار کێشەکان هەلێکن بۆ پێشکەوتن.

٨- کێشەکان بە یەك ڕۆژ چارەسەر ناکرێن: هەرگیز بە یەك شەو ڕێگەی سەد ساڵە نانرێت، هەرگیزیش بە یەکجار کێشە چارەسەر ناکرێت. هەر جارێكو کێشەیەك چارەسەربکە، بە چارەسەرکردنی هەر کێشەیەکیان ئاهەنگێك بگێڕەو دوای ئەوە هەنگاوی دواتر بنێ.

٩- لە کاتی ڕەخنەگرتن بە باشی هەڵسوکەوت بکە: ڕەخنەگرتن پاکەرەوەی دڵە ئەگەر ڕەخنەگرتن بە هەڕەشەکردنو قسە وتنو سوکایەتی کردن بزانیت، ئەوا هەرگیز دڵخۆش نابیت. هەمیشە پۆزەتیفیانە تەماشای ڕەخنەگرتن بکە. وەکو شتێك وەری بگرە بۆ فێربوون، باوەڕتان هەبێت کە یارمەتیتان دەدات بۆ پێشکەوتنتان. کاتێك کەسێك ڕەخنەمان لێدەگرێت، ئەوە دەست پێشخەرییەکە بۆ گۆڕانکاری.

١٠- ڕەخنەگرتن هەڵبسەنگێنە: گوێگرتن لە ڕەخنەگرتن زۆرباشەو لە کاتی گوێگرتن هەڵیبسەنگێنە، بزانە ئایا لە ڕووی خۆشەویستیو دڵسۆزییەوەیە.

١١- ڕەخنەگرتنی کەسانی باوەڕپێکراو دەوڵەمەندییە: کاتێك لەو کەسانەی باوەڕمان پێیان هەیە ڕەخنە دەبیستین، دەبێت خۆمان لە شوێنی وەرزشکارێك دابنێین کە ڕاهێنەرەکەمان یارمەتیمان دەداتو چاوەڕێی کاردانەوەیەکی باشترمان لێ دەکات، پێویستە ئەو ڕەخنەگرتنە بە دەوڵەمەندی بزانین.

(خوشەویستیت ببەخشە بە هەموو کەس، خراپەش لەگەڵ کەسدا مەکە).

# هەرگیز مەڵێ خۆزگە ژیانم بە شێوازێکی تر دەبوو، چونکە ژیان لە بەرژەوەندی تۆ ڕێدەکات!

هەوڵبدە خۆت بدۆزیتەوەو نوێنەرایەتی خۆت بکەی!

هەرتاکێك لە ئێمە جیاواز لەوانی تر دروستکراوە، واتە هیچ تاکێك لە ئێمە هاوشێوەی ئەوی تریان دروست نەکراوە، ئەم جیاوازییە بۆچی؟ پرسیارێکە کە ڕەنگە زۆرێك لە ئێمە لە خەیاڵماندا بخولێتەوە، بەڵام وەڵامەکەی گەلێ شتی شاراوەی لە پشت ئەم بابەتە جێهێشتووە، کە خودا نەبێت کەس بەم نهێنیانە نازانێت، بەڵام ئەوەی مرۆڤ باسی دەکات لەم بابەتەی کە ئاشکرایە لای هەمووان ئەوەیە کاتێك مرۆڤەکان جیاواز دروستکراون، کەواتە لە ڕوانگەی بیرکردنەوەشەوە جیاوازن، ڕەنگە هەندێك مرۆڤ هاوڕابن لە بابەتێکدا، بەڵام جیاوازن لە کۆمەڵێك بابەتی تردا، کەواتە ناتوانین بڵێین هەندێ مرۆڤ جیاوازنین لە ڕوانگەی بیرکردنەوەوە.

کەواتە لێرەدا بابەتێك ڕوون دەبێتەوە هەر تاکێك لە ئێمە جیاوازە چ لە ڕووی جەستەییەوە، یاخود ژیرییەوە، ئەو ڕاستییەش زانستی بۆ ماوەزانی پێمان دەڵێت: (کە لە نێوان هەزاران خانەدا خانەیەك هەیە کە لە توانایدا هەیە مرۆڤ بگۆڕێت)، تەنانەت ئەو کاتەش کە دایكو باوکت بە یەکگەیشتن، تۆ لە نێوان سێسەد هەزار جۆردا هەلی ئەوەت هەیە ئەو مرۆڤە بیت کە ئێستا هەیت، بە واتایەکی تر ئەگەر سێسەدهەزار خوشك و براشت هەبێت هێشتا بواری ئەوە هەیە کەسێکی جیاواز بیت لە هیچکام لە خوشكو براکانت نەچی ئەوە تەنیا گریمانە نییە، بەڵکو ڕاستییەکی زانستییە، کەواتە هەریەکە لە ئێمە خاوەنی وزەو توانایەکین جیاواز لە وانی تر، کەواتە ئێستا هیچ ئەگەرێك نەماوە (تاکو لاسایی کەسانی تر بکەیتەوە)، ئێستا کاتی ئەوەیە کە خۆت بدۆزیتەوەو نوێنەرایەتی خۆت بکەیت، ئینجا گرنگ نییە چ بوارێك بێت، کاتێك قسە لەگەڵ خەڵکیدا دەکەیت، هەوڵمەدە خۆت بە وێنەی ئەوانی تر بچوێنیت، بەڵکو وێنەی ڕاستەقینەی خۆت نیشانبدە، هەروەها کاتێك لەسەر تەختی شانۆ شانۆگەری پێشکەش دەکەیت، هەوڵمەدە لاسایی کەسانی تر بکەیتەوە، بەڵکو دەبێت خۆت خۆتبی، وەك ئەکتەری بەناوبانگی جیهانی (چارلی چاپلن) کاتێك دەستی بە دروستکردنی فیلمەکانی کرد، دەرهێنەرەکەی داوای ئەوەی لێدەکرد کە دەبێت لاسایی ئەکتەرێکی کۆمیدی بکاتەوە، کە ئەو سەردەمە لە ئەڵمانیا ناوبانگی هەبوو، بەڵام چارلی چاپڵن ئەوەی ڕەتکردەوە، کە جگە لە خوودی خۆی ڕۆڵی گوزارشتکردن لە هەر کەسێکی دیکە ببینێت.

بە پێچەوانەوە کاتێك (ماری ماگرێت) دەستی بە نواندن کردو هەوڵیدەدا وەك ئەکتەرێکی کۆمیدی ئیرلەندی دەربچێت شکستی هێنا، بەڵام کاتێك هەوڵی دا خۆی بێت، (کچێکی سادەی گوندنشینی ویلایەتی میسۆری) سەرکەوتنی بەدەستهێناو بووە دیارترین بواری ئێزگە لە نیویۆرك. ئایا چی وای لە (ئەنگلیلۆ) کرد کە سیانزە کتێبو بە هەزاران وتاری ڕۆژنامەنووسی لە بارەی پەروەردەی منداڵەوە نووسیوە؟ (ئەنگلیلۆ) لە وتەیەکیدا دەڵێت: (کەس لەو کەسە داماوتر نییە کە هەوڵی ئەوەدەدا کەسێك بێت جیاواز لە کەسێتی خۆی، لە ڕووی جەستەییەوە بێت، یان لە ڕووی ژیرییەوە)، بێگومان بە پێی ئەزموونی چەند ساڵەی خۆی بەو وەڵامە گەیشتووە.

لێرەدا پێویستە توانای خۆت لە بوارێکدا دەربخەیت، دەزانی بۆ؟ چونکە تۆ ئەفراندنێکی نوێی لەم جیهانەدا، بەمە دڵشادبە، زۆربەی ئەو شتانەی سروشت پێشکەشتی دەکات بەکاریان بهێنە، لەبەرئەوە هونەری ڕەفتارکردن شتێکی خۆییە، لە میانەی خۆتەوە گۆرانی بچڕەو لە میانەی خۆتەوە نیگارەکانت بکێشە. لێرەدا دەبێت، بوونی خۆت بسەلمێنیتو بڵێیت منیش ئامادەم لە مەیدانەکەوە ڕووبەڕووی هەموو بەربەستێکیش دەبمەوە کە دەکەوێتە سەر ڕێگاکەم، کەواتە با هەموومان وێنەی ڕاستەقینەی خۆمان بین، دوور بین لە لاسایی کردنەوە لە مرۆڤە جیاوازەکان.

عبدالمناف عبدالعزیز

شاگوڵ عوسمان



# بڕیار لە پێناو گەلێکدا کاردەکات!

**بڕیار لە پێناو گەلێکدا کاردەکات،**
سەرەتا منداڵێکە پاشان گەورە دەبێت، وەك گەنجێکی سەرکەوتوو خاوەن ئەزموون پڕ لە دەستکەوت، پاشان خێزان دروست دەکەن کە هەوڵی بەختەوەرییان دەداتو دابینکردنی ژینگەیەکی دروست بە پێی دەستورە شکۆدارەکانی ژیانی ڕەسەنایەتیو دیوانێکی پڕ لە خێرو سەروەری، دەتکاتە بازرگانێکی بێسنور لەسەر بنەماکانی ڕەوشتی ڕەسەنایەتیو شارەزاییو لێهاتوویی، دەتکاتە سەرکردەیەکی پڕ لە خزمەتو پڕ لە بوێری خاوەنی یەکسانی نێو ڕیزەکانی کۆمەلگە، دەیەوێت لە ژیانی خۆمانەوە فێربین.

**بڕیار لە پێناو گەلێکدا کاردەکات،**
دەتکاتە خاوەنی ژیان، سمبولێك فێردەکات، کە ژیان هاوچەرخانە لێی دەڕوانێت، پێت دەڵێت: بەختەوەری لە ناخی خۆتدایە، بڕیار دەیەوێت لە کەشتییەکەی ژیان هەروا گوزەرنەکەیت، ئاگادارت دەکاتەوە، گەر خەونو ئامانجت نەبێت، دەبیتە ئامانجو پێکراوی ئامانجی کەسانی تر، گەرپلانت نەبێت دەبێت هەرلە خۆزگەکانی نێو ژیانی خۆتدا خەیاڵ بتباتەوە، دەیەوێت بەهەنگاوەکانی یەکەم پلیکانەی ئامانجەکانت شاد کاتەوە، لە ڕێی پلانی دەستەواژەییەکانی ژیانی خۆتەوە.

**بڕیار لە پێناو گەلێکدا کاردەکات،**
مافمان بۆ وەردەگرێتەوە، نایەوێت هەروا بە سادەیی لە ژیان گوزەربکەین، بەڵکو دەیەوێت زاناتربین، پێمان دەڵێت بێ هیوامەبە، ئێستا نەزووەو نەدرەنگە، بڕیار دەرفەتێکە لە نێو ژیانی تایبەتی خۆمانو پەیڕەوکردنی دەستوورێکی هەمیشەییە بۆ ژیانمان، دەبێت درك بەوە بکەین هێندە دڵسۆزی تێدا بەدی دەکرێت، بڕیار بوونەتە ڕاوێژی ئێمە، ئێمە لە عەقڵە بچووکەکان، لە وشە زبرەکان، ڕزگاردەکاتو دەمان گەیەنێت بە ئاکاری عەقڵە گەورەکان.

**بڕیار لە پێناو گەلێکدا کاردەکات،**
خۆشەویستییەکی ڕاستەقینەی دەوێت، بەوپەڕی لێهاتووییەوە، دەڵێت: خۆشحاڵی خێزانەکان لێرەوە دەست پێ دەکات، دەیەوێت ئەندازەسازی بکات بۆ ژیان، نازدارمان دەکاتەوە، بە خۆشەویستیو فرمێسك ڕشتن، وەفاداری، جێی ئەو ژیانە دەگرێتەوە، کە هەریەکەمان دەسپێرێت بە گۆشەیەکی ژیان، فێری ماناکانی حەق خوازیمان دەکات، هەرچەندە قورسە، بەڵام هەلگرانیشی کەمە.

**بڕیار لە پێناو گەلێکدا کاردەکات،**
هەر لە هەنگاوە بچکۆلانەکەی، منداڵانەوە، گرنگی دەدات بە پرۆسەکانی منداڵ، وەڵامێك دەدا بە پەروەردەکاران، کە منداڵان وەڵامی خۆیان بداتەوەو بڕیاری ژیانی سروشتی خۆیان بدەنەوە بە چاودێرێکی پڕ لە سەلیقەی ئەو خێزانەی بڕیار دەیەوێت بەختەوەری بکات، دەیەوێت منداڵ بکاتە سەنتەرێکی دوولایەنەو بەخشراوێکە کە پێکەوەیی پێخۆشە.

**بڕیار لە پێناو گەلێکدا کاردەکات،**
ئاراستەی تۆی دەوێت، لە پێدانی دەسەڵاتو چۆنییەتی وەرگرتنی ئەو دەسەڵاتە، بڕیار دەیەوێت سەربەستت کات، سەرپشکمان دەکات، حەزەکان دەکاتە ئارەزووی ژیانمان، بەڵام پێی خۆشە یارمەتیمان بدات چۆن بگەین بەو بڕیارە، فێرت دەکات چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو بڕیارە بکەیت کە بڕیارت داوە ژیانتی بۆ بکەیتە سەروەری تا نیشانەیەکی پڕخێرو سەودای چاکانە بێت.

**بڕیار لە پێناو گەلێکدا کاردەکات،**
پێی خۆشە گەر وەك تاك خاوەن ئیرادەو پلەیەکی بەهێزیتو توانای بەڕێوەبردنی خۆتو کارگێڕی کردنی مامەڵەکانی تری ژیانت هەیە، دەیەوێت ئەم ئیرادەو توانایە لە

نێو خێزانەکەتدا پەیڕەو بکەیت، دەیەوێت هەموو ســەرکردەیەکی پڕ لە خزمەت بین بۆ یەکتری، دەیەوێت سنوری ژیانی یەکتری بپارێزین، دەیەوێت لە جێی زمان گوڵ ئاسا ئاخاوتنی پــێ بکەین، دەیەوێت ژیان بکاتە باخچەیــەكو ئێمەش باخــەوان، دەیەوێت، ئاگادارمــان بکاتەوە، گەر دەتەوێت لە ژیان براوە بیت ئەوا خۆت بۆ سزاکان ئامادە بکە، دەیەوێت لەگەڵ هەرســاڵو ژمارەیەکی نوێ ژیانێکی نوێ دروست بکەین.

**بڕیــار لە پێنــاو گەلێکــدا کاردەکات،**

دەبێــت دوای خوێندنــەوەی ٣٦ ژمــارەی بڕیار، ئایا خوێنەرانــی لە ژمارە چەندی بڕیارەکانی خۆیاندایــن؟ دەبێت چێکێکی خۆمان بکەینەوە پێش بڕیارو دوای بڕیار، تەنانــەت ژمــارە بە ژمــارە خاوەندارێتی زیاتــر بگەڕێنینەوە بۆ خۆمانو ســنوری دەسەڵاتەکانی ژیانو لەگەڵ دیدی تایبەت بە ژیانی خۆمانو ڕەچاوکردنی مامەڵەکانی دەوروبەرمان تازە کردبێتەوە.

شــایەنی ئــەوەن بەڕێزتان ســوپاس بکرێن، کە ئێمەتان کۆکردووەتەوە لە پێناو بڕیاربوونمان، لە پێنــاو خاوەن بوونمان، سوپاستان دەکەین کە بەڕێزتان پێش ئێمە درکتان بە بوونمان کرد، سوپاس بۆ بەڕێز خاوەن ئیمتیاز، هیوای سەرکەوتنی زیاتری بــۆ دەخوازین، هەموو ئەو خۆشــحاڵییەی ئێمە لە بۆ بڕیار ببێتە گەورەترین تێشوو بۆ ئێســتاو دوارۆژ بێت، سوپاست دەکەین کە هێنــدە ڕەســەنایەتی ئێمەت بە لاوە گرنگە، بــۆ مانا جوانەکانــی دڵۆپێك، کە لــە لای ئێمە نوســراوەکانی سەرنوســەر هێنــدەی دەریایــەك بــە پێزە کــە هەر وشەیەکی شەپۆلێکی تازە دەدات لە ژیانو هزری ئێمە، سوپاســت دەکەین، دەپرسیت ئاخۆ، کێ ســەرکردایەتیم دەکات؟ ترســی لاســایی کردنەوەی ئێمــەت هەیە، چونکە بەڕێزت باش دەزانیت لاسایی کردنەوەمان ئامادەییەکانی مرۆڤ لە ناو دەبات، کۆمان دەکەیتەوە لە چــوار هونەرەکەی ژیان، تا دوانەکەوین، پێش ماڵئاوای هەســتێك بە خۆشەویستانو سۆزێکمان پێ دەبەخشیت.

ســوپاس بــۆ بەڕێوەبەری نووســین، کــە هەمیشــە پێمــان دەڵێــت: چاکەکان ئاشــکرابکەن، بــێ هیوامەبە لــە ئیرادەی خۆتــانو هەڵــەی کەســانی دی دووبــارە نەکەینــەوە، هەندێجــار، پێویســتمان بە زەنگێکــە بــۆ وریابوونەوەمــان جــا ئەو زەنگــە بەردێکیش بێــت، دێت لە بۆنێکی خۆشــدا، کــە لە بۆنی دایکــم دەچێت، لە میوانداریيەکــی بــە پێزدا، بــۆ ژیانێکی ئاسوودە، تەنها پەرداخێك شەربەت...!

سوپاسی ئێمە بۆ گشت ستافی گۆشەی کارگێــڕیو هەمــوو ئــەو بەڕێزانــەی بە بابەتی بە پێز ئەم بەشەیان ڕازاندۆتەوە، خواســتتانە بــە نەرمــی بنوێنیــن نەك بەهێــز، خامــە پــڕ لــە ئومێدەکانــی بەڕێزتانە، کە لە نێو کارگێڕی بە گوفتارو کارگێــری بەچیرۆك، خواســتان کارگێڕی ئێمەیە بە کردار، خواســتی ژیری ئێوەیە، توانایــی کارگێــڕی ژیانــی خۆمانمــان هەیە، ئیــرادەی زیاترمان دەداتێ، ئەوە خواســتو ماندووبوونــی بەڕێزتانــە، لە نێــوان ڕازەکانمانــدا، نهێنــی کەســێتی ســەرکەوتوومان پێــدەدەن، سوپاســتان دەکەیــن (کە دەتانەوێــت بەرهەمی باش ببەخشن، تا بەرهەمی باشتر هەبێت).

سوپاســی ئێمــە بــۆ گشــت ســتافی بازاڕســازیو هەمــوو ئــەو بەڕێزانەی بە بابەتە بەپێزەکانیان سازێکی تر دەسازێنن بــۆ بازاڕەکانــی ئەمــڕۆی ئێمــە، ئێــوە دەتانەوێــت لە ڕێی ســازکردنی بازاڕێکی گونجــاو، دروســتی مامەڵــەکان، زیاتــر تاکەکان ڕاگیراو بکات، سوپاســتان دەکەین کــە دەتانەوێت فێرمان بکــەن کە دەبێت گیرفانێکیــش هەبێت پڕبێــت لە پلان تا درك بەوە بکەین ئێمە خاوەنی سەرمایەو بازرگانین نەك بە پێچەوانەوە.

سوپاس بۆ ستافی گەشەپێدان، هەموو ئەو بەڕێزانەی بە بابەتی قەشــەنگ ئەم گۆشەیە پڕدەکەن، لە نیگای خۆشەویستی بــۆ ئێمــە، سوپاســیان دەکەین کــە ئێمە هیــچ کات تەنیا ناکەن، گــەر بە تەنهاش بین لەگەڵ خەونەکانــی خۆماندا مامەڵە دەکەین، سوپاستان دەکەین کە لە دووتوێی ژیانی خۆماندا بیردەهێنرێنەوە بە دایکێکی گوشــراوی میهرەبان، بابەگیان بمبەخشە ئێســتا لە خۆشەویستی تێگەیشتم، لە نێو ئازارەکانو هیوای ژیانی ماڵی بابە گەورە، لە دڵەوە، هەوڵ بدە بەرەو باشتر بڕۆیت، ئەوەی لە ناختدایە، تکایە گرنگی پێ بدە، هاوشــێوەی گەشــتیارو بەهارێکــی، پڕ لە ئەزموونی، بە هیواین هەمیشە ڕازەکانتان وێنای جوانتر بێت لە شانۆی بەهار.

ســوپاس بــۆ ســتافی بڕیاری منــداڵانو پەروەردەو هەموو ئەو بەڕێزانەی بابەتی پڕ لە ئەزموون دەکەنە پەروەردە، جێی خامەکانیان دیــارەو لە ڕێی نوســراوەکانیانەوە هیوایەکتان تێــدا دەبینرێت، کە لەگــەڵ خەمی نەوەکانی خۆتــان خەمــی نەوەکانی نێــو ماڵەکانی تر دەخــۆن، چونکە دەزانــن دواجار منداڵ تەنها هی ئەو خێزانە نییەو تێکەڵ بە یەکتر دەبن، بەڵکو بەشــی میللەتو کۆمەڵگاشــی پێوەیە، بڕیــار دەیەوێت، خێزانەکان بەختەوەر بکات، خاڵــی هاوبەشــیان پێبدات، فێــری ماناکانی لێبوردەییو فێری وتنی وشەی خۆشەویستیمان دەکات، دڵە شووشەکان بپارێزێت، بەختەوەری زیاترتان بۆ دەخوازێت.

سوپاس بۆ ستافی دیزاینەر، بەڕێزتان ســەلیقەییتان هاوشــێوەی ڕەنگــەکان ڕەنگاڵەیــە، بابەتــەکان ڕازاوەتردەکــەنو لــە نێــو دێڕەکاندا پێگەیەکــی تر دەدەن بــە بابەتەکان، بەڕێزتان نوســراوەکان بە ڕەنگێك وێنــە دەدوێــنو ڕەمزێك دەدەن بە بابەتــەکان، دەستخۆشــیتان لێدەکەین بۆ ئەو هەموو سەلیقەییو توانایەتان، کە ڕەنگەکانتان کردووەتە جوانترین دەروازە، پێــش ئاشــنا بوونمان بــە نوســراوەکە، بەڕێزتــان لە بری پێنوس  بابەتەکان، بە وێنە دەکێشــن، بە ڕەنــگ بۆیەی دەکەن، هیوادارین ژیانتان ڕەنگاڵەتر بێت.

پێش ماڵئاوایی، سەرەتایەکی تر بە ئێمە دەدات، دەمانخاتــە بیری خۆمــان، چونکە بە چەنــد ئەزمونێکــی تر ئاشــنا بووین، پیرۆزبایی لە گشت ســتافی بڕیار دەکەین، هیوای لەشســاغیو ســەروەری زیاترتان بۆ دەخوازیــن، هیواداریــن ســەربەرزی دنیاو دوارۆژ بن،  پیرۆزبایی لە گشــت خوێنەری بڕیاردەکــەم، ئەوەی بڕیار ئاماژەی پێداوەو هەوڵــی بــۆ دەدات، وای کردووە کە گشــت ســتافە بەڕێزەکــەی، کردارەکانــی خۆیانە بووەتــە بابەتی گۆڤارەکــە، ئێمەش هەوڵ بدەیــن لەوانــەوە فێربین، ئــەوەی کردار نەبێــت لای خۆمــان شــیاوی گوفتارمــان نەبێت، دووبارە سوپاســتان دەکەین، دڵنیام ئێوەن کــە کار دەکەنو بڕیارتان داوە ئێمە بگەڕێینەوە ســەر بڕیاری خۆمــانو زیاتر برەو بە ژیان  بدەیــن، خودایە بەردەوامی زیاتریان پێبدەو کاری باشــترو ناوازەتریان پــێ بــدە، چونکە ئــەم بەڕێزانــە بڕیاری خۆشــبەختی گەلێکیان داوە تەنها لە پێناو تۆدا خودایە، سوپاست دەکەین خودا لەسەر نیعمەتی ئەم پەیڤە جوانانە، ئەم خزمەتە ناوازەیە، دووبارە پیرۆزباییتان لێ دەکەین بە هیوای بڕیاری باشــتر بۆ گشــت لایەك، زۆرخۆشــحاڵین بێجگە لە ماڵەکانی خۆمان، ماڵێکــی تــر هەیە کــە خەممــان دەخۆن، یارمەتیمــان دەدەن، خۆشــحاڵمان دەکــەن، دەیانەوێــت فێرمان بکــەنو پەروەردەمان بکەن، ئەو ماڵەش بڕیاری بەڕێزو ئازیزە!

سەروەر حەسەن



# بڕیار پاسۆردی پێگەی سەرکەوتن‌و کامەرانی

«د. إبراهیم فقی» لە کتێبی (حەوت نهێنی هێزی خودیی)دا دەڵێت: «زۆر کەس بە دوای کلیلی جادوویی کردنەوەی دەرگای هێزەکانیاندا دەگەڕێن... دەگەڕێن‌و دەگەڕێن، کەچی کلیلەکە لە نێو دەستەکانیاندایە. دەتوانن دەمودەست بەکاری بهێنن، ئەگەر وشە نهێنییەکەیان زانی، کە ئەویش بڕیاردانە».

ئەگەر مرۆڤ تەواوی زانیاری‌و زانستی دەربارەی ڕێگاو شێوازو نهێنییەکانی کامەرانبوون‌و سەرکەوتنی هەبێت‌و پڕ بێت لە وزەو توانایی‌و هەموو پێداویستی‌و بەرتواناییەکی دەستەبەرکردنیانی لە بەردەستدا بێت، ئەگەر بڕیار نەدات‌و دواتر بە پێی بڕیارەکەی جوڵەو هەڵسوکەوت نەکات، هیچ...

کەسێك ژانەسەری هەیە، تەواو بێتاقەت بووە، لە تەنیشتییەوە دەرمانی ئازارشکێن‌و پەرداخێك ئاوی لێیە، ئەگەر دەست درێژ نەکات‌و دەرمانەکە نەکاتە دەمییەوەو ئاوەکەی بەسەردا نەکات (ئومێدی چاکبوونەوەی نەبێت)، دەبێت ئازار بچێژێت، ئەگەر دەرمانەکە بناسێت‌و شێوەی بەکارهێنانیشی بزانێت. هیوادرێژیی‌و خۆزگە خواستن هیچ کارێك بەرێ ناکەن، دەستکەوتێك نائافرێنن، شتێك ناگۆڕن، ئەوەی گۆڕانکاری دروست دەکات بڕیاردانە.

کە بێئومێدبوون‌و شکست، بڕیارت پێبدات، شکستەکانیش دەبنە سوود، دەبنە ئەزموون بۆ هەنگاوەکانی داهاتوو.. هەر تەماشا بکەو ئاخ هەڵکێشەو خۆزگە بخوازەو بگری‌و ناڵەناڵت بێت، کە بڕیار نەدەیت، تەنها پاساوهێنانەوەو تۆمەتبارکردنی شت‌و کەسەکان هاوڕێت دەبن‌و ئاسوودەت دەکەن، چەند لاوازییە بە پاساوهێنانەوە بۆ شکست‌و دۆڕانەکان ئاسوودە بین، چەند گەورەییە ئاوەدانی ناخ‌و گەیشتن بە ئامانج ئاسوودەمان بکات!!

لەو دەرگایە دەدەیت‌و پێتوایە کلیلەکەی ونەو فیل بۆی ناکرێتەوە، بەڵام بیرت نەچێت هەر وەك وشەی نهێنی (بکرێوە سمسم)ی چیرۆکی عەلی بابا کە بەردێکی زەبەلاحی بەردەم گەنجینەیەك دەکاتەوە، ئاوەهاش وشەی نهێنی یاخود پاسۆردی «بڕیار» تاشەبەردی سەر ڕێگای بەرەو گەورەبوونت بۆ هەمیشە بۆ لادەدات.

تەماشای ڕابردووت بکە، چەند کاری لە بیروهزرتدا گەورەت بە بڕیارێکی واقیعیانە سوکو ئاسان کردووە. لە ناڕەحەتی‌و گەورەیی مەسەلەکان سڵ نەکەیتەوەو بڕیارت دوانەخەیت، وەك وتراوە: «هەموو شتێك گرانە پێش ئەوەی ئاسان بێت».

دووجارو سێجارو هەزار جار جەخت لە خۆت بکەرەوەو خەمخۆری بەو بیگەیەنە ئەو شوێنەی کە دەتەوێت، بیگەیەنە، ئەگەر بتەوێت دەیگەیەنیت، ئیتر واز لە پاساو هێنانەوە بهێنە، هەرچی ئاخ‌و خەفەت‌و ناڕەحەتی‌و ئاستەنگو ڕێگری هەیە، تێپەڕ دەبن، وازمەهێنە، کۆڵمەدە... هەر ئا ئێستا بڕیار بدە، بڕیاربدە ئیتر خۆت بە گەورەو بەتوانا تەماشا بکەیت، گەورەتر لە هەموو کێشەکان، بە تواناتر لە هەموو ئاستەنگەکان.

بڕیاردان سووکو ئاسانە، بە مەرجێك هێزە ڕاستەقینەکەتی لە پشتەوە بێت، چیت دەوێت؟! دەتەوێت ببیتە پزیشك، ئەندازیار، مامۆستا، هونەرمەند، وەرگێڕ، دارتاش، خاوەنی کۆمپانیا، بلیاردێر، خۆشەویستی هەموو خەڵك، سەرکەوتوو لە کاردا، بەڕێوەبەر؟! چی؟ دەتەوێت ببیتە کرێکارێکی ئازا، ئەندازیارێکی کارڕاست، وەرزشەوانێکی ناودار، سیاسییەکی ڕاستگۆی بەجورئەت، دادخواز، خۆپیشاندەرێکی ڕاستبێژی بە

ورەی ئاشتیخواز؟ زانایەکی گەورەی بواری زانست، خواپەرستێکی دڵڕۆشن، وابەستە بە کاتو وادەکانەوە؟ چیت دەوێت؟ دەتەوێت ببیتە بەرگدروویەکی لێهاتوو، فوتابییەکی زیرەكو ژیر، مامۆستایەکی خۆشگفت، دڵسۆزو دڵگار، نانەوایەکی نان جوان، فیتەرێکی شارەزا، ئەفسەرێکی دڵسۆز، ڕۆژنامەنووسێکی ناودار، باوك، یان دایکێکی نموونەیی، پەروەرشیارێکی ڕێزدار، چێشتلێنەرێك کە خواردنەکانی دەمودەستیان پێوە بخورێت، دوکاندارێك هەمیشە سەرقاڵ بە کڕیارەکانییەوە، هەواڵگرێکی خزمەتکاری گەل، ڕدێن سپییەکی قسەخۆش، ئەکتەرێکی بە توانا، خانمێکی دەم بەخەندەی نەرمونیانی بەویقار، گەنجێکی چالاکی وریاو زرنگ، کەسێکی ڕەگداکوتراو کە قسەو توانجو ویستی خەڵك کاری تێنەکات؟

دەتەوێت واز لە جگەرەکێشان، یان مەیخواردنەوە بهێنیت؟ هەمیشە شیك پۆش بیت، لەگەڵ هاوسەرەکەت تەنها خۆشەویستی بگۆڕیتەوە؟ هەموو کارەکانت بە پێی پلان بڕۆن، بەخشندە بیت (بە ماددەو کاتو هەڵوێستت)؟! چیت دەوێت، بتەوێت، دروستەو هیچ نەنگییەکی تێدا نییەو گەورەییشە خەمی گەورەت هەبێت!

زۆرباشە، کارێکی تا ئەوپەڕی مەزنە، بەڵام بەر لە هەموو ئەوانە دەبێت ببیتە بڕیاردەرێکی بە ئیرادەی ورەبەرزی چاونەترس، پێداگر لەسەر خۆسەرخستن بە پلیکانەکانی کامەرانبوونو سەرکەوتندا، بە تاقەتو ئارامگر لەسەر کەوتنو درەنگ گەیشتنو تاقیکردنەوەی شێوازی هەمەچەشن.

لە یادت بێت کە بڕیارتدا، ئازایانە بڕیاربدەو پێویستییەکانی بڕیارەکەت جێبەجێ بکەو ڕێزی بڕیاری خۆت بگرە، چونکە دوای لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە بڕیارەکەتت داوە، ئیتر بیگەیەنە ئەنجام، بە ئەنجامگەیاندنی هەر بڕیارێکیشت ورەو متمانەت بۆ بڕیاری دواتر پێدەدات.

ئێستا دەستپێبکە، پاسۆردی پێگەی سەرکەوتنو کامەرانی دەزانیت، ئیتر ئەگەر هەوڵ نەدەیتو بڕیاری دروستو ئازایانە نەدەیت خۆت تاوانباریت. سوێند بۆ خۆت بخۆ کە دەبێت ئەمە بکەیتو ئەمەی تر نەکەیت، ئەگەر تەممەڵیت نواند سزای خۆت بدە، (سزایەکی سوودبەخش)، لە دوای سەرکەوتن لە بڕیارەکانیشتدا خەڵاتی خۆت بکەو دەستخۆشی لێبکەو لە نێوان خۆتو خۆتدا نازناوی خۆش خۆش لە خۆت بنێ. بەردوامبە تا بڕیاردان دەتگەیەنێتە ئامانجو بۆ ژیانیشت دەبێتە نەریتێکی تری ئەرێنی.

و: محەممەد هاشم




# ژمێرکارییەکی ئاسان

# $ 60,000,000,000

ڕۆژێکیان لە تەلەفزیۆن هەواڵێك بڵاوکرایەوە، کە وڵاتێکی عەرەبی گرێبەستێکی واژۆ کردووە لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەبارەت بە کڕینی کۆمەڵێك چەكو تەقەمەنی بە بڕی (٦٠) ملیار دۆلاری ئەمریکی، منیش لەبەرئەوەی ئەوەندە حەز لە سیاسەتو موناقەشەکردنی بابەتی سیاسی ناکەم، بەڵام ڕێز لە بڕیاری سیاسی هەموو وڵاتێك دەگرم لە جیهاندا، کاری منیش نییە تا بزانم کەڵکی کڕینی ئەم چەكو تەقەمەنییانە چەندە لەگەڵ ئەوەی کە نەبێت، بەڵام تەنها ویستم وەك بەبیرهێنانەوەیەك بیروهزری خوێنەری ئازیز ئاشنا بکەم بە ژمارەی (٦٠) ملیار دۆلار، بۆ ئەوەی بزانرێت، ئەم ژمارەیە چی پێ دەکرێت:

١- ئەگەر ئەم بڕە پارەیە، (٦٠) ملیار دۆلار، دابەش بکەین بەسەر هەموو موسوڵمانانی جیهاندا، هەریەکەیان (٦٠) دۆلاری بەردەکەوێت.

٢- ئەم ژمارەیە بەشی کڕینی (٦) ملیۆن ئۆتۆمبێل دەکات.

٣- بەم پارەیە دەتوانرێت (٣٠٠) فڕۆکەی بارهەڵگری پێ بکڕدرێت، لە جۆری (بۆینغ ٧٧٧).

٤- بەم پارەیە دەتوانرێت (٢) ملیۆن شوقەی نیشتەجێبوونی پێ دروست بکرێت بە ڕووبەری (١٠٠)م٢.

٥- بەم پارەیە دەتوانرێت (٦٠٠٠) نەخۆشخانەی پێ دروست بکرێت بە هەموو پێداویستیەکانییەوە.

٦- بەم پارەیە دەتوانرێت (٣٠٠) ملیۆن تەن گەنم بکڕدرێت.

٧- بەم پارەیە دەتوانرێت (٤٠) تاوەری وەك تاوەری شێخ خەلیفەی لە دوبەی دروست بکرێت.

٨- بەم پارەیە دەتوانرێت (٢،٤٠٠،٠٠٠) کگم لە زێڕ (ئاڵتون) بکڕدرێت، کە دەکاتە (٢٤) هەزار تەن.

بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە کە: دەتوانرێت بەم بڕە پارەیە، واتە (٦٠) ملیار دۆلار، (٧٧،٠٠٠) پیشەو هەلی کار دابین بکرێت لە ئەمریکا بۆ ماوەی (١٠) ساڵ!!!

نووسینی: محسن العبیدی الصفار

ن: محمد حسن يوسف
و: دڵشاد محەممەد

# دیاریکردنی ئامانج لە گرنگترین کلیلەکانی سەرکەوتنە




بەلگەنەویستە کە زانستی پەرەپێدانی خود شتێکی تازەیە بەنیسبەت ژینگەی وڵاتانی ناخۆرئاواییەوە، ئەگەرچی خۆرئاوا هەر زوو بەم زانستە ئاشنابووەو دەستو پەنجەی لەگەڵدا نەرمکردووە.. لە بنەماو پرەنسیپەکانی ئەم زانستەش ئەوەیە: بۆ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بێنیت پێویستە ئامانجەکەت بە ڕوونیو بە وردی دیاری بکەیتو کاتێکی گونجاویش بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە دابنێیت، هەروەها بۆئەوەی ئامانجیش قابیلی هێنانەدی بێت، پێویستە واقیعی بێتو لەگەڵ توانستەکانتدا گونجاوو شیاو بێت..

بەڕێوەبەرو یاریزانی تیپی (یانکیزی بەیسبۆڵ لە نیویۆرك) لە وتەیەکیدا دەڵێت: «ئەگەر تۆ ئامانجی خۆت نازانیت، ئەوا دەگەیتە ڕێیەکی تر کە ئارەزووی ناکەیت)!!»

دوو یاریزانی یاری تۆپی پێ بێنە پێش چاوی خۆت، یەکێکیان دابەزییە نێو یاریگاو بیر لە هیچ شتێك ناکاتەوە، جگە لە تۆمارکردنی گۆڵ نەبێت، هەرکاتێك لە یاریزانێکی هاوڕێیەوە شووتێکی بۆ لێدەدرێت، یەکسەر بەرەو گۆڵی تیپی بەرانبەر شووت لێدەدات تا گۆڵ بکات.. بەڵام ئەویتریان دابەزییە نێو یاریگاو هەموو ئامانجی ئەوەیە موراوەغە بە یاریزانانی تیپی بەرانبەر بکات، هەرکاتێك لە لایەن هاوڕێکانییەوە تۆپەکە دەگاتە قاچی، هەوڵدەدات یاری بە تۆپەکە بکاتو موراوەغە بە هەموو ئەو یاریزانانە بکات کە دێنە بەردەمی تا تۆپەکەی لێ بسێنن!!

ئایا کامیان لە گەیشتن بە گۆڵی تیپەکەی تر سەرکەوتوو دەبێتو دەتوانێت گۆڵ تۆمار بکات؟ کامیان شۆرەتو ناوبانگی زیاترو جەماوەری زۆرترە؟

بێگومان یاریزانی یەکەم، ئەوەی کە تۆمارکردنی گۆڵی لەبەرچاوی خۆی داناوەو بەهەندی وەرگرتووەو یاریکردنەکەی تەرخانکردووە بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجە کە «گۆڵکردنە».

هەمیشە بیربکەوە لەوەی «ئەگەر مەبەستو ئامانجێکت هەبوو، ئەوا هیچ کات هۆکارو وەسیلەی گونجاو بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستو ئامانجە لەبن نایەت» هەروەها بیر لەو وتەیەی ناپلیۆن پۆناپەرت بکەرەوە: کە دەڵێت: ئەو کەسەی نییەتی خۆی لەسەر سەرکەوتن گرێداوە، واتە: ئامانجی دیاریکردووەو هەوڵی هێنانەدی دەدات، وشەی «مەحاڵ» بە زوبانیدا نایەت).

(فرانكلین ڕۆزفلت) لەوبارەیەوە دەڵێت: «دیاریکردنی ئامانجەکانت سەرمایەیەکە بەهیچ نرخێك مەزەندە .ناکرێت، لەبەرئەوەی دیاریکردنی سەراپای ژیانتە».

لە ئەزموونە خۆشەکانم لەگەڵ بابەتی «دیاریکردنی ئامانج»، جارێکیان ئامۆژگاری یەکێك لە هاوڕێکانم کرد سەبارەت بە پێویستیو زەرورەتی دیاریکردنی ئامانج لە ژیاندا، بەڵام ئەو بە گێڕانەوەی ئەزموونی خۆی لەو بارەوە سەرسامی کردمو وتی: زۆرێك لە هاوڕێو هاوپۆلەکانم هانیاندەدام لەسەر زەرورەتی دانانو دیاریکردنی ئامانجو نووسینی ئامانجەکە، بەڵام من هیچ گرنگیم بەو مەسەلەیە نەدا... تا ئەوەی ڕۆژێك بیرمکردەوەو بە خۆمم وت: بۆچی ئامانجێکی نووسراو بۆ خۆم دیاری نەکەم؟ ئیدی ئەوە ڕوویدا، لە پەڕەیەکی بچووکدا نووسیم: «ئامانجم ئەوەیە کە یەکەمی گروپەکەم بم» پاشان ئەو پەڕەیەم لەسەر

کتێبخانەکەم دانا.. هەرکات بمویستایە واز لە سەعیکردن بهێنمو ڕووبکەمە شتێکی تر، چاوم دەچووە سەر پەڕەکەو لە ناخی خۆمدا دەمووت: ئەوەی بیەوێت یەکەم بێت، نابێت یاری بکات، پێویستە گرنگی بە کۆششکردنەکەی بدات، ئیدی جارێکی تر دەگەڕامەوە بۆ سەر سەعیکردنو کۆششکردنەکەم... تا کاتی تاقیکردنەوەکان هاتەپێش، دوای ڕاگەیاندنی ئەنجامەکان دەرکەوت کە یەکەمی گروپەکەی خۆمم!!

خوشکێك باس لە سەرگوزشتەی خۆی لەگەڵ دیاریکردنی ئامانجی تایبەت بە خۆی دەکاتو دەڵێت: ڕۆژێك بڕیاری تەواوەتیمدا لەسەر دانانو دیاریکردنی ئەو ئامانجەی کە سوێند بە خوا ڕۆژێك لە ڕۆژان بە خەیاڵمدا نەهاتووەو بیرم لێنەکردۆتەوە، بەڵام لە ناکاو -پاش بینینی خەونێکی گەورە- بڕیارمدا کە «قورئانی پیرۆز لەبەر بکەم».. بۆیە ئەو ئامانجەم خستە پێش چاوەو بڕیارمدا دەستی پێبکەم، بەڵام چۆن؟ هەستم بە ئیرادەو عەزمێکی بەهێز کرد کە پێشتر هەستم پێنەکردبوو، هەر ئەو کات بڕیارمدا کە قورئانی پیرۆز بە تەفسیرەوە لەبەر بکەم، نەخشەیەکی هەفتانەم دانا تا لەهەر هەفتەیەکدا (حزب)ێکی تەواوی قورئان بە تەفسیرەوە لەبەر بکەمو واز لە موتالاو نووسین بهێنم کە هەموو ئاواتو ئامانجێکم بوو، سوپاس بۆ خودا توانیم بەو ئامانجە بگەم کە دیاریم کردبوو، داواکارم لە پەروەردگار کە قورئان بە کردارو گوفتارو هەڵسوکەوت لە دڵو دەروونمدا بچەسپێنێت.. بۆیە ئیرادەو عەزیمەتو باوەڕ بەخوداو پشتبەستن بەخوا گرنگترین کلیلەکانی سەرکەوتنە..

هەمیشە ئەوەت لە یاد بێت، ئەگەر ئامانجێکی دیاریکراوی تایبەت بە خۆت نەبوو، ئەوا لە ئامانجی کەسانی تردا ژیان دەگوزەرێنیت، کەواتە بۆچی خۆت دەکەیتە نێچیر تا کەسانی تر بەسەرتدا زاڵ بنو بۆ خۆت کۆنترۆڵی خۆت ناکەیت لە ڕێگەی دیاریکردنی ئامانجەکانت؟

زانایانی بواری پەرەپێدانی خودی (التطویر الذاتی) دەڵێن: زۆر کەم دەبینین کەسێك ئامانجی خۆی دیاریکردبێت لە بەدیهێنانیدا شکستی هێنابێت!! بەڵام بەبێ هەستکردن بە ئامانج ئێمە ونو سەرگەردانین.

با لە ئاستی تاکەوە بڕۆین بۆ ئاستی دەزگاو دامەزراوەو ڕێکخراوەکان.. هەر دامەزراوەو ڕێکخراوێك -جا گشتی بێت، یان تایبەتی، یا قازانج نەویست بێت- هەر دەبێت ئامانجی بوونی خۆی بە وردی دیاری بکات، تا بتوانێت لە بازاڕدا بمێنێتەوەو کێبەرکێی کۆمپانیاکانی تر بکات!!

با تەماشای هەندێك لە دامەزراوە گشتییەکانی ئێستا بکەین، دەبینین ئەو ئامانجەی لە دەستداوە کە لە پێناویدا دامەزراوە، بۆیە ئیدی ناتوانێت بەو ڕۆڵە هەستێت کە پێش دروستبوونی بۆی دارێژراوە، ئەمەش لەسەر ئەو جۆرە دامەزراوانەی پێویست دەکات -ئەگەر دەیانەوێت لە جیهانی بووندا بمێننەوە- تا هەستن بە دووبارە دارشتنەوەی ئامانجەکانیانو سروشتی ئەو ڕۆڵەی پێویستە بیگێڕن..

لەمەوە دەگەینە ئەو ئاکامەی، پێویستە لەسەر هەڵسوڕێنەرانو سەرپەرشتیارانی دامەزراوەکان -بە هەموو جۆرەکانیانەوە- کە هەستن بە دیاریکردنێکی وردی ئامانجی پەیوەستو پەیوەندیدار بە دامەزراوەکە، تا کرێکارو فەرمانبەرەکان سروشتی ئەو ڕۆڵەیان بۆ ڕوونبێتەوە کە پێویستە لەسەریان ئەنجامی بدەن، لە پێناو هێنانەدی ئامانجە دیاریکراوەکەدا..

بەڵام لە حاڵی ئەنجامنەدانی ئەم کارەدا -دیاریکردنی ئامانج- ئەوا لە هیچ دامەزراوەیەك چاوەڕوان ناکرێت کە هیچکام لەو ئامانجانەی بێنێتەدی کە لە پرۆسەی پەرەپێدانی وڵاتدا بەشداریی کارایان هەیە، بگرە ڕەنگە ڕۆڵەکەی ببێتە پەکخەری پرۆسەی پەرەپێدان، هەروەك چۆن ئەو کارە پاڵ بە هەموو تاكو فەرمانبەرانی دامەزراوەکەوە دەنێت -بە هۆی نەبوونی ئامانجی گشتیی دامەزراوەکەیان- کە هەوڵبدەن بۆ هێنانەدی ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیان لەسەر حسابی ئامانجەکانی دامەزراوەکە بەشێوەیەکی گشتی!!

هەروەها نەبوونی ئامانج دەبێتە هۆی زیادبوونی گەندەڵی، لە کاتێکدا ئامانجی ڕاستەقینەی کاری دامەزراوەکە بە هیچ شێوەیەك دیارو زانراو نییە، دواجار ئەم کارە بە هیچ جۆرێك ملکەچی پێوەرەکانی لێپێچینەوەو لێپرسینەوە نابێت..

یوسف واژەیی

# کچی دایکی کوردستانم

{پێشکەشە بەو گوندەی بەر لە لاشەی دڵی سووتا}

من گوندێکی ناو باوەشی سەختو هەڵەمووتو لێڕی شاربازێڕم.

مەکۆی ڕۆژانی خەباتو مەتەرێزی ورەو هێزی شۆڕشگێڕم. لە دەفتەری یادەوەری بەرخۆدانا یەکەم دێڕم.

وەکو دەستە خوشکەکانم کچی دایکی کودستانم، سەرتاپا ڕەونەقو جوانیم کوڕی شاری خۆڕاگرو ئازای هەڵمەتو قوربانیم.

هەناسەی من شنەی شەنی خەرمانی ڕەنجی ئێوەیەو گەشەو بژێوی پێوەیە، ساباتم سەباتی ڕۆحە، کزەی شەماڵی نزارم وەك شەپۆلی نزای سەحەر ئارام بەخشە، لەناو ئەلبومی سینەما هەموو وێنەیەکی جوانی تیا پەخشە. کە بۆ باڵای بەرزو ئەرزم بۆتە نەخشە.

تۆزێ لە تۆزو خۆڵی من دەرمانەو گڵی دوورییەو سارێژو قەتماغی ژانەو سەبوورییە.

من خانەی خانەدانانو خانەخوێی بێنەوایانو لانەی لانەوازەکانم..

وەك چیاکانم سەربەرزم، وەکو تاڤگە خێری ئەرزم، هەموو سەرتاشێکم تاتو سووژدەگاهی عارفانە.

من دەماری کوردستانیم لە ڕەگی داربەڕووەکانم پتەوترە، ئەو کاتانەی داگیرکەر لەسەر پشتم بێت، ئومێدی ئازادیم لا بەبرەو ترە.

من پشتیوانی شۆڕشو پەرچەکرداری هێرشو گۆڕەپانێکی کۆشش بووم.

سەردەمانێك باو باهۆزێك سەری گێژوو ورکردبووم، نەوەکانی فرکردبووم، دەستو پەنجەی لە بەستەڵەکی ئەستەما سرکردبووم.

قوڵپی هەموو کانییەکو خوڕەی هەموو کارێزێکم هەنسكو جۆشی گریانەو زووخاوی جەرگی بریانە.

لاشەم هەمووی بۆتە چاوو، چاویش چاوەو چاوەش ئاوی حەسرەتو ئاهی تێزاوەو شینی دایکی کوردستانی دڵسووتاوە!

ئا: گۆران جەمیل

# ماڵێك پڕ لە خۆشەویستی





ئایا ئـارەزووی ئـەوە دەكەیـت كە هاوسەرەكەت ببینی كە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ شادمانو لێو بە خەندە بێت؟ كاتێك قسەت لەگەڵدا بكات وشەی پڕ لە خۆشەویستیو ناسك بەكاربهێنێت؟ دڵخۆشیو كراوەییو گەشبینی لـە ڕووخساریدا ببینیت؟ بە دوو دەستی خۆشەویستیو سۆز لە ئامێزت بگرێت؟ پاشان بـۆت باس بكات كە چۆن زیاد لە پێنج ماركێت گەڕاوە تاكو ئەم دیارییە باشو جوانو بەنرخەت بۆ بكڕێت، ئارەزوو دەكەیت كە بە زمانی بولبول بانگت بكات: خۆشەویستەكەم.. هەناسەكەم.. ئەی جوانتر لە هەموو شت لە ژیانمدا؟

تۆش ئەوەی ئەو ئـارەزوی دەكات لە خواردن بـۆت ئامادەكـردووە، كاتێك كە دادەنیشن لەسەر مێزی نانخواردن، وتەی شیرین لەگەڵتدا بەكاربهێنێو گاڵتەوگەپت لەگەڵدا بـكات، بە ڕووتـدا پێبكەنێ، بە دەسـتو پەنجە میهرەبانەكەی پارووەك بـە دەمتـەوە بـكاتو تۆش بـە هەمان شێوە؟

وتوێژ لە نێوانتاندا دەست پێبكاتو خۆزگـە بخـوازنو لـە خـودا بپاڕێنەوە شـەوگار دووهێندە درێژ بكاتـەوە، خۆر هەڵنەیەت بۆئەوەی ئەم دوو دڵە لە یەك جیانەبنەوە، دڵانێك لێوان لێو لە هەستی بەرزو ئەوینو پەیوەست بوون بۆ یەكتر.

ئـەم خەیاڵانەی كە باسكرا، خەونی هەر تاكێكی مێینەیە لە كۆمەڵگاكەماندا، شتگەلێكن كە ڕۆژانە خەونی پێوە دەبینین لە هەمووساتو چاوتروكانێكدا.

ئەی كانگای میهروخۆشەویستی، ئەم دیمەنـە سەرسـوڕهێنەرە تـۆ دەتوانیت دروستی بكەیت، بە دەستی خۆت، هەر خۆشت دەبی بـە نووسـەرو دەرهێنەرو پاڵەوان.

تۆ دروستكەری بەختەوەریت.. ئایا لەو باوەڕەدایت كەسی تر بتوانێت ئەو دیمەنە دروست بكات باشتر لە تۆ؟ بێگومان نە.. نەخێر.. دیسان نەخێر.. دیسان نەخێر.

دڵنیـام تـۆ ئێسـتا یەكـەم شـت بە خەیاڵـتدا بێت، ئەوەیە كـە "چۆن؟ ئایا دەتوانم؟"

بەڵێ دەتوانیت.. مەسەلەكە زۆر لەوە ئاسانترە..

بەختـەوەری مەسـەلەیەكی تەواوە.. هـەروەك كوێـرەوەری مەسـەلەیەكی تەواوە.

زانایانی دەروونناسی دەڵێن: ئەگەر بۆ ماوەی چركەیەك لە بەرامبەر ئافرەتێكدا ڕاوەستای بـە زەردەخەنەوە، ئـەوە بە دڵنیاییـەوە هەسـت بـە بەختـەوەری دەكەیت.. هەروەها ڕابووەستیو چڕوچاوو برۆ بـدەی بە یەكـدا بۆ مـاوەی چەند چركەیـەك، ئـەوە هەسـت دەكەیـت كە دڵتەنگی دەسـتی گرتووە بەسـەر دڵتداو بێزاری سوار كۆڵت بووە.

دەمەوێت ئەوەت پێ بڵێم تۆ دەتوانی وا لە هاوسـەرەكەت بكەیـت بەختەوەرو دەم بـە خەندە بێت، بـەڵام بە مەرجێك ئەگەر لە تۆدا بزەو ڕووخۆشی ببینێت..

تـۆ دەتوانیـت بـە دەسـتی خـۆت بەختەوەری دروست بكەیت..

ئەگەر وشەی جوانت لە هاوسەرەكەت دەوێت، ئەوە وشەی جوانی پێبڵێ..

ئەگـەر خەڵاتـت لـە هاوسـەرەكەت دەوێت، ئەوە گوڵی پێشكەش بكە..

تەماشـای خودی خـۆت بكـە.. ئایە واتكردووە كە وشەی باش بڕواتە ناو دڵی هاوسەرەكەتەوە؟

ئایا كە درەنـگ دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ، گوێی لە وشەی جوان دەبێت؟

ئایـا ئەگـەر نەهاتنـەوەی بـۆ ماڵ درێـژەی كێشـا، تەلەفۆنـی بـۆ دەكەیت بۆئـەوەی بزانی بارودۆخـی چۆنە؟ وای لێ بكەی كە گوێی لە وشـەی جوانو باش بێت، یان نامەیەكی بۆ دەنێریو پێی بڵێ كە تامەزرۆی بینینی؟!

كاتێك كە ئافرەت داوا لە پیاوەكەی دەكات كـە بـۆی ببێـت بـە ئاسـمانو داپۆشێت، پێویستە ئافرەتیش بۆی ببێت بـە زەوی، تۆ بۆی ببە بە زەوی، بۆئەوەی ئەویش بـۆت ببێت بە ئاسـمان، چونكە باش نییـەو ڕەوا نییە كە داوا لە خەڵكی بكەیت بۆ شتێك كە تۆ خۆت وانەبیت.

ئاسـانە جێبەجێكردنی ئاستەم نییە، تۆ هەنگاوەكانت هەڵبێنە، پاشـان گۆڕانو پێشكەوتنو باشـبوون دەبینیت، هەروەها گوێبیستی وشەی خۆشەویستی دەبیت.

دەڵێن: گۆڕینی هاوسەر زۆر ئەستەمە!

دەڵێن: (ئـەم ئەزموونـە مەحكومی شكستە، هەر لە ئێستاوە پێش دەستكردن بـە جێبەجێكردنـی)، (هاوسـەرەكەم پیاوێكـی زۆر كەللـە ڕەقـە هیـچ كەس ناتوانێـت هەڵسـوكەوتی لەگەڵـدا بكات، دەرچوونی وشەی خۆشەویستی لە دەمی، وەك دەرچوونـی نـەوت وایـە لـە دڵی زەوییەوە).....

ئایا دەتوانم ئەوەی كە ڕقم لێیەتی لە هاوسەرەكەمدا بیگۆڕم؟

ئەم پرسـیارە كە بە سەرسـوڕمانەوە

دەیکات...

لە وەڵامدا: بەڵێ.. دەتوانیت ئەو شتەی کە ڕقت لێیەتی لە هاوسەرەکەتدا بیگۆڕیت.

ژنان ڕەشبینانە دەڵێن: ئاخر خۆ ئێمە خوێنەوار نین، یاخود خۆ بڕوانامەیەکی بەرزمان نییە، یان کەسایەتییەکی بەهێزمان نییە، شێوازێکی وام نییە لە هەڵسوکەوت، یان قسەی شیرین لەگەڵ هاوسەرەکەمدا، یان جوانییەکی زۆرم نییە.. یان... یان... ئەمانەو دەیانی تر لەو شتانەی کە بە بەربەستی دەزانی.

دەڵێم: هەموو ئافرەتێك دەتوانێت پیاوەکەی بگۆڕێت، جا چ خوێنەوار بن، یان نەخوێنەوار، خاوەن کەسایەتییەکی بەهێز بن، یان لاواز، خاوەنی جوانی بن، یان بە پێچەوانەوە، لە سەرخۆ بن، یان تووڕە.

بە مەرجێك:

دەبێت پێداگری بکەیتو سووربیو بەردەوام بیت لەسەر هەوڵدان بۆ گۆڕینی، خاوەن ئیرادەیەکی بەهێز بیت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەربەستەکان.

سەرەتا جەخت بکەرەوە لە سەر ئەوەی کە یەکەم جار چاکسازی لە خۆتدا بکە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ﴾ (الرعد:١١).

واتە: (بەڕاستی خوا بارو حاڵی هیچ گەلێك ناگۆڕێت، هەتا ئەوان خۆیان باروحاڵی خۆیان نەگۆڕن).

هەوڵ لەگەڵ خۆتدا بدە کە نەرمونیانو ڕەوشت جوانو ئارامگر بیت، لە ڕووبەڕووبوونەوەی، هەروەها خۆت ڕابێنە لەسەر ڕووخۆشیو وشەی باشو لێبوردەییو سنگفراوانی.

هەرگیز ڕێگا مەدە ڕەشبینی بێتە دڵتەوە، هەر چەندە ماوەکە درێژە بکێشێتو ئەنجامت دەستنەکەوێت.

ئێستا بۆ چوونت چییە؟ ئایا لەو بڕوایەدایت کە ئەم مەرجانە قورسنو لە دەرەوەی توانای مرۆڤدان؟ بۆ نموونە جوانی.

نەخێر.. خوا ئاسانی کردووە بۆ هەموو مرۆڤێك، هەرکەسەش بەشە ئەندازەی خۆی دەبات.. هەرکەسەی بە ئەندازەی هیممەتی خۆی..

کەوا بوو مێشکت ئامادەکە بۆ سەرکەوتن.. جا بۆچوونت هەر چۆن بێت سەبارەت بە خۆت.. تۆ لەوە باشتری کە وێنای دەکەیت.

زاهیر شێخ ڕەزا

# دایکی ڕاستەقینە!

دوو ئافرەت لە سەر منداڵێك لێیان دەبێتە دەمەقاڵەو هەر یەکەیان دەڵێت: من دایکی ڕاستەقینەی ئەم منداڵەم، ئەو دەمە وەك ئێستا زانست پەرەی نەسەندبوو، تا بە پشکنینی پزیشکی کێشەکە یەك لایی بکەنەوە، بەم شێوەیە بەردەوام دەبن تا گرفتەکە گەورە دەبێتو دەیبەنە بەردەم قازی، لە بەردەم قازیش هەردووك بانگەشەی ئەوە دەکەن کە خۆی دایکی ڕاستەقینەی منداڵەکەیە، منداڵەکەش ساوایەو ئاگای لەم هەراو ناکۆکییە نییە، بەڵام وا دیارە قازی زۆر زیرەك و بیر وردە، بە بەردەستەکانی دەڵێت: مێزێکم بۆ بهێنن لە نێوان ئەو دوو ئافرەتەدا دایبنێنو منداڵەکەی بخەنە سەر.

دوای ئەوە داوا لە هەردوو ئافرەتەکە دەکات کە هەر یەکەیان دەستێکی منداڵەکە بگرێو ڕایبکێشێت، کێ توانی منداڵەکە وەرگرێ ئەوە منداڵەکە بۆ خۆی، دەست دەکەن بە ڕاکێشانی منداڵەکە، ساتێك هەردوو لا ڕایدەکێشن منداڵەکە لەو نێوانەدا دەست دەکات بە گریان، لەگەڵ بیستنی گریانەکە هەر زوو ئافرەتێکیان دەست بەر دەداو منداڵەکە دەچێتە لای ئافرەتەکەی تر، ئەویش توند لە باوەشی دەگرێو بە سنگییەوە دەنوسێنێو لە خۆشیانا دەست دەکات بە گریانو دەڵێت: هاتییەوە بۆ لام کۆرپە ئازیزەکەم، ئافرەتەکەی تریش کە لەم جەرو حەبلەدا دۆڕاوە سەری داخستووەو هیچ ناڵێت!

قازی بێدەنگی هۆڵەکە دەشکێنێو دەڵێت: من ئێستا بڕیاری خۆم ئەدەم، منداڵەکە لەو ئافرەتە بسێننو بیدەنە دەست ئەم ئافرەتەی تر، چونکە ئەمە دایکی ڕاستەقینەی منداڵەکەیە، ئامادەبووان هەموویان سەریان سوڕدەمێنێ لەم فەرمانەی قازی!!

کاتێك پرسیار لە قازی دەکەن بۆچی؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەم ئافرەتە چونکە منداڵەکە بەشێکە لە جەرگیو جگەرگۆشەی خۆیەتی دڵی نەهات زۆر بە بەهێز منداڵەکە ڕابکێشێ هەر کە گوێی لە گریانی بوو دەستی بەردا، نەوەك ئازار بە قۆڵی منداڵەکە بگات، بەڵام ئەوی تریان سەلامەتی منداڵەکەی بە لاوە گرنگ نەبوو، ئەوەی بە لایەوە گرنگ بوو بردنەوەی قەزییەکە بوو لە بەردەم قازیدا، ئیدی ئامادەبووان سەریان سوڕما بوو لە زیرەکی جەنابی قازی!

لەم سەردەمەی ئێستاشماندا زۆر جار ئەو کەسانەی لە مافی خۆیان دەبوورن کەسە دڵسۆزو خاوەن مافەکانن، نەك خاوەنی ماف نەبن، دەبێت کەسی بازرگان خودی کارگەو کۆمپانیاکەی بە لاوە گرنگ بێت، نەك قازانجێکی کاتی کەم، دایکانو باوکان دەبێت داهاتوو کەسایەتی ڕۆڵەکانیان بە لاوە گرنگ بێت، نەك بە تەنیا ئێستای منداڵەکانیان لە بەر چاو بێت، دڵسۆزەکانی وڵات دەبێ وڵاتیان بە لاوە گرنگ بێت نەك بردنەوەی خولێکی هەڵبژاردن!

# مەهێڵە خەم ئاسوودەبیت زەوت بکات!

ناصح خالد

چەند ڕۆژێکی پڕ لە ناخۆشیو نیگەرانی بردەسەر.. وایلێهات هەستی دەکرد کە هەموو شتێك لەم ژیانەدا بێ ماناو پڕوپوچە.. بەمەش گوڕوتینی بۆ هیچ کارێك نەما.. توانای خوێندنەوەشی تەواو لە دەستدا.. هەرچی هەوڵێکیشی دەدا بۆ نووسین بێ ئاکام بوو.

دوای ئەوەی حاڵەتی خۆونکردنو خۆ لە دەستدانی زیادیکرد.. ڕۆژ بە ڕۆژ پەشۆکاوترو داڕماوتر دەبوو، بۆیە بڕیاریدا سەردانی پزیشکی گشتی بکات، جا کاتێك پزیشك پشکنینی گشتی بۆ ئەنجامداو بینی هیچ نەخۆشییەکی نییە، لێی پرسی: ئایا ئامادەی تەنیا یەك ڕۆژ بە گوێرەی ڕێنماییەکانی من بجوڵێیتەوە؟ ئەویش بە (بەڵێ) وەڵامیدایەوە.. ئینجا پزیشك داوایلێکرد کە ڕۆژی دواتر بچێتە ئەو شوێنەی کە خۆشترین کاتەکانی منداڵی تێدا بەسەربردووە، هەروەکو داوایلێکرد کە لەم ڕۆژەدا قسە لەگەڵ کەس نەکاتو هیچ شتێکیش نەنووسێت، گوێ لە ڕادیۆش نەگرێت، پاشان پزیشکەکە چوار ڕستەی بۆ نووسیو هەر یەکەی لە ناو زەرفێکی تایبەتدا داناو دایخست، ئینجا پێی گوت: نامەی یەکەم لە کاتژمێر نۆی بەیانی بیکەرەوە، دووەم لە کاتژمێر دوانزە، سێیەم کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆو چوارەمیش کاتژمێر شەشی ئێوارە.. بەو مەرجەی بە وردی ڕێنماییەکانی نێو ئەم زەرفانە پەیڕەو بکات.

لێی پرسی: ئایا ئەمەت بە ڕاستە.. پزیشك وەڵامیدایەوە: بێگومان، پاشان نهێنی ئەمەت بۆ دەردەکەوێت.

بەم شێوەیە پیاوەکە لە سپێدەی ڕۆژی دواتر چووە کەناری ڕووبارێك.. چونکە خۆشترین کاتەکانی تەمەنی منداڵی لەم شوێنەدا بەسەربردبوو.. لە کاتی دیاریکراودا نامەی یەکەمی کردەوەو بینی تێیدا نوسراوە: (بە وریاییەوە گوێبگرە)، تەنها ئەوەندەو بەس، سەرەتا گومانی لە کارەکەدا هەبوو کە چۆن دەتوانێت بۆ ماوەی سێ کاتژمێرو تا کاتی کردنەوەی نامەی دووەم تەنیا گوێبگرێت، بەڵام هەر دەبێت پابەندبێت بە شوێنکەوتنی ڕێنماییەکانی پزیشك.. بۆیە گوێی ڕادێرا..

لە سەرەتادا گوێبیستی دەنگە ڕاهاتووەکانی وەك شەپۆلەکانی دەریاو باڵندەکان دەبوو، دوای ماوەیەك وایلێهات توانی ئەو دەنگانەش ببیستێت کە سەرەتا ڕوونو ئاشکرا نەبوون.

جا لە کاتی گوێ شلکردنیدا دەستیکرد بە بیرکردنەوە لەو وانانەی کە لە منداڵیدا لە ڕووبارەکەوە فێریبووە، وەك (ئارامگرتن، ڕێزگرتن، پشتبەستنی شتەکان بە یەکتر)، دواتر وایلێهات نەك تەنها گوێبیستی دەنگەکان دەبوو، بەڵکو گوێبیستی بێدەنگیش دەبوو، بەمەش جۆرێك لە ئارامی لە ناخیدا چەکەرەیکرد.

لە کاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆ زەرفی دووەمی کردەوەو ئەم ڕستەیەی خوێندەوە (هەوڵدە بیرکردنەوەت بگەڕێنەوە بۆ دواوە).. بۆیە دەستیکرد بە بیرکردنەوە لە کۆنترین یادەوەرییەکانی منداڵی خۆی، هەروا لەو یادەوەرییە خۆشانەش کە پێیدا تێپەڕیوە، بیری لەو ساتانە دەکردەوە کە هیچ نیگەرانییەکی نەبووە، ساتەوەختە پڕ لە شادییەکانی وەبیر خۆی دەهێنایەوە، بەمەش وردە وردە گەرموگوڕیو متمانە بە خۆبوون لە دەروونیدا گەشەیکرد.

لە کاتژمێر سێدا نامەی سێیەمی کردەوە کە تێیدا نوسرابوو، (پاڵنەرەکانی ناخت بدۆزەوە)، لە خۆی پرسی: ئەرێ بە ڕاست پاڵنەرەکانم چین؟ لە سەرەتادا گومانی وابوو کە مەبەست لەم ڕستەیە ئەوەیە کە بیر لەو شتانە بکاتەوە کە خۆی دەیەوێت، وەك (سەرکەوتن، داهێنان، پشودان)، بەڵام بینی ئەمانە تەنیا بەس نین، بۆیە زیاترو زیاتر ڕۆچوو لە بیرکردنەوەو پاڵنەرەکانیداو بەراوردیشی دەکردن بە بەهابالاکانەوە.. بینی کە پاڵنەرەکانی وەکو سەرکەوتنی خودو زاڵبوون بەسەر کەسانی ترداو هاوشێوەی ئەم پاڵنەرانەش هیچ بەهایەکی نییە.. چونکە هیچ پەیوەندیەکیان بە بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتییەوە نییە، دواجار گەیشتە وەڵامێکی دروست، خۆی دەگێڕێتەوە (لە ساتەوەختێکی ڕامانو بیرکردنەوەدا ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئەگەر پاڵنەرەکانی کەسێك هەڵەبوون.. ئەوا هیچ شتێکی ڕاستو دروستی لێوە بەرهەم نایەت، هیچ جیاوازیەکیشی نییە جا ئەو کەسە سەرکردە بێت، یان خاوەن کۆمپانیا، یان سەرتاشو بەس... (ئەگەر گرنگیدانەکانت لەسەر خزمەتکردنی تەنیا خودی خۆت، نەك یارمەتیدانی کەسانی تر بنیاتنرابوو، ئەوا تۆ بەشێوەیەکی جوان بەکارەکانت هەڵناستیت.. بەڵام ئەگەر تۆ لە پێناو بەهایەکی باڵادا دێیتە مەیدان، ئەوا بە شێوەیەکی جوانیش لەم مەیدانەدا یاری دەکەیت).

کاتێکیش کە کاتژمێر شەش داهات، نامەی چوارەمی کردەوەو بینی نوسراوە (ئەوەی دڵتەنگی کردوویت، لەسەر لم بینوسە)، بۆیە لەسەر زەوی دانیشتو بە پارچەدارێك نووسی (خەمەکانم.. خەمەکانم).. پاشان ڕووی وەرگێڕا تا بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە.. کاتێك چەند هەنگاوێکی نا ئاوڕیدایەوەو بینی.. شەپۆلێکی ئاوەکە هاتو ئەوەی کە نووسیبووی سڕییەوە.

ئالانی

# تەنها بە پیادەکردنی چوار ئامۆژگاری، ماڵئاوایی لە ورگت بکە!



خۆرزگارکردن لە چەوریی کەڵەکەبووی ورگ، لە قورسترین و دژوارترین ئەو ئەرکانەیە کە رووبەرووت دەبێتەوە، هەربۆیە مرۆڤ پێویستی بە یاسایەکی خۆراکیو وەرزشکردنی تایبەت هەیە بۆ دەربازبوون لە ورگو ئەو چەورییەی لەو ناوچەیەدا کۆبووەتەوە.

**هۆکاری گەورەبوونی ورگ دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانە:**

( جووڵەی کەم. خواردنەوە گازییەکان، خەوتنی ڕاستەوخۆی دوای نانخواردن، خواردنی ژەمە خۆراکی خێرا بە تایبەت ئەو خواردنانەی کە زۆر چەورن، لەگەڵ زۆرخواردنی برژاو، پڕ شەکر، هەموو ئەمانە هۆکارێکی سەرەکیین بۆ دروستبوونی ورگ).

دەتوانین تەنها بە پیادەکردنی ئەم چوار ئامۆژگارییە لەو دیاردەیە خۆمان ڕزگاربکەین:

**١- ڕۆیشتن بە پێ (پیادەڕۆیی)، هۆکاری سەرەکییە بۆ ڕزگار بوونت لە ورگ:**

لێکۆڵینەوە زانستییەکان سەلماندویانە کە وەرزشی بە پێ ڕۆیشتن بە شێوەیەکی سروشتی چاکترین ڕێگەیە کە لە چەوری کەڵەکەبووی ورگ ڕزگارت دەکات، بەبێئەوەی پێویستت بە خەرجکردنی ماڵێکی زۆر هەبێت بۆ کڕینی حەبی کێش دابەزاندن، کە بە زۆری زیانی زیاترەو کاریگەرییەکی ئەو تۆشی لە بچووکبوونەوەی ورگدا نییە.

لە لایەکی دیکەوە وەرزشێکی ئاسانەو لەگەڵ هەموو تەمەنێکدا دەگونجێت.

کاتێك بە شێوەیەکی ڕێكوپێك ڕۆژانە هەڵدەستیت بەم وەرزشە، بە هەنگاوی فراوانو ڕاست ڕۆیشتنت، ئەو چەورییەی لە ورگتدایە دەست دەکات بە تواندنەوەو گۆڕان بۆ ماسولکەی بەهێزو بە توانا.

بۆئەوەی وەرزشی پیادەڕۆیی پیادە بکەیت، پێویستە پەیوەست بیت بە چەند ڕێسایەکەوە کە گرەنتییە بۆئەوەی بە خێرایی ئەنجامی هەبێت.

- بەردەوام بە لە پیادەڕۆیی بەشێوەیەکی ڕێکوپێكو دانانی کاتی دیاریکراو بۆ ئەنجامدانی ئەو وەرزشە.
- لە کاتی ڕۆیشتندا پشتت ڕاست بکەرەوە، چونکە پشتی چەماوە یارمەتیدەرە لە دەرکەوتنی ورگت بۆ پێشەوە، بەشێوەیەکی گشتی چەوری لە دیواری ورگدا کەڵەکە دەبێت.
- باشتر وایە ڕاستەوخۆ هیچ جۆرە خواردنێك نەخۆیت، لە پێش ڕۆیشتندا.

**دووەم: دووركەوتنەوە لە خواردنی پڕ شەکر:**

بێگومان ئەو خواردنانەی دەوڵەمەندن بە مادەی شەکر، کاریگەرییەکی باشو ئەرێنی هەیە بۆ چالاککردنی بیروهزرو بەخشینی وزە، بەڵام زیادەڕۆیی لەو خواردنانەدا ئەنجامەکەی پێچەوانە دەکاتەوە، ئەو کاتە دەبێتە هۆی دروستبوونی چەوری نەخوازراو لە دەوروبەری ورگدا.

خواردنە پڕ شەکرەکان تەنها لە شیرینیدا کورت هەڵناهێنن، بەڵکو خواردنە ئامادە خێراکان لە ڕێژەیەکی زۆری شەکر پێکهاتوون، هەروەها خواردنەوە گازدارەکان، هەندێك میوەش ڕێژەیەکی زۆری شەکری تێدایە، بۆ نموونە: مانجۆ، ترێ، هەنجیر، خورما، هەرسکردنیان دژوارە بۆیە دەبێتە هۆی دروستبوونی ورگ.

لەبەرئەوە شارەزایانی بواری لەشجوانی ئامۆژگاریمان دەکەن، بە گۆڕینی خواردنە پڕ شەکرەکان بە سەوزەی تازە، کە بە سروشتی خۆیان چەوریو شەکریان تێدا نییە، لەگەڵ ئەوەشدا وزەی پێویستت بە درێژایی ئەو ڕۆژە پێ دەبەخشێت.

**سێیەم: خەوتن چارەسەرێکی ئەفسووناوییە بۆ ڕزگاربوون لە ورگت:**

زۆرمان سەبارەت بە گرنگی خەو بیستووە، بۆ تەندروستی تاك، بەڵام ئایا دەزانیت کاتی پێویستو گونجاوی خەو چەندە، واتە دەزانیت لە شەو ڕۆژێکدا لانی کەم دەبێت چەند کاتژمێر بخەویت؟

ئەو ماوەیەش چەند یارمەتیت دەدات بۆ ڕزگار بوونت لە ورگت؟

لێکۆڵینەوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە پەیوەندییەکی باش هەیە لە نێوان خەوتنو دروستبوونی چەوری ورگدا.

بۆ ئەم مەبەستەش تاقیکردنەوەیان لەسەر چەندین کەس ئەنجامداوە بۆ سەلماندنی ڕاستی پەیوەندی نێوان خەوتنی باشو چەوری ورگ، لە کۆتاییدا گەیشتنە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

تاقیکردنەوەکە لەسەر دوو کۆمەڵ ئەنجامدرا، کۆمەڵی یەکەم لە شەووڕۆژێکدا تەنها پێنج کاتژمێر دەخەوتن، لەو نێوەندەدا کۆمەڵی دووەم ڕۆژانە لانی کەم هەشت کاتژمێر دەخەوتن، لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەندازەی ورگیان پێش ئەزموونەکە، بەشێوەیەك هەموویان لە یەك ئاستدا بوون.

سەرەنجام بۆیان دەرکەوت کە ئەو کەسانەی ڕۆژانە لە پێنج کاتژمێر کەمتر دەخەون، ڕۆژانە لە کارەکانیاندا بە خێرایی هەستیان بە ماندووبوون دەکرد، هەروەها وزەی پێویستیان بۆ ئەنجامدانی کارەکانی ڕۆژانەیان پێنەبوو، ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کرداری هەرسکردنو توانەوەی چەوری لە ورگدا خاو بێتەوە، بەڵام کۆمەڵی دووەم کە ڕۆژانە حەوت بۆ هەشت کاتژمێر بە شێوەیەکی ڕێكو پێك دەخەوتن، لە ناوبردنو توانەوەی چەوری ورگیان بەشێوەیەکی زۆر باش بەڕێوە دەچوو، بە پێچەوانەی کۆمەڵی یەکەمەوە هەستیان بە ئارامی دەکردو وزەی پێویستیشیان بۆ تەواوی ڕۆژەکە پێ بوو.

**چوارەم: پیادەکردنی ڕاهێنانە وەرزشییەکان بۆ تواندنەوەی چەوری ورگ:** پیادەکردنی ڕاهێنانی وەرزشی لەگەڵ جێبەجێکردنی ئەو خاڵانەی باسمان کرد، هاوکات پیادەکردنی یاسایەکی خۆراکی دەوڵەمەند بە سەوزەو میوە.. بەرهەمەکانی شیر کە چەورییان کەمە، گۆشتی بێ چەوری، یەکێکە لە ڕێگا باشەکان بۆ ڕزگاربوونت لە چەوری ورگ، هەروەکو (کریستین ڕۆزنیلوم) پرۆفیسۆری بواری خۆراکدەمەنی لە زانکۆی ویلایەتی جۆرجیا دەڵێت: ئاسانترین ڕێگەیەو زۆرترین کاریگەری هەیە بۆ ڕزگار بوونت لە چەوری ورگ، جێبەجێکردنی یاسایەکی خۆراکی تەندروست کە تێشکە وزەی کەم بێت، لەگەڵ پیادەکردنی وەرزشێك ڕۆژانە لانی کەم ٦٠ خولەك بخایەنێت، بۆ زانیاریت وەرزشکردن بەشێوەیەکی چڕوپڕ، یارمەتیت دەدات لەسەر سوتاندنو لە ناوبردنی چەوری بە شێوەیەکی خێراتر!

پەری شێخ کەریم

خێزانی بەختەوەر

# جوانی ئافرەتو گومانو ئیرەیی هاوسەران!

ئەگـەر ئـەم جوانییـە بەهرەیەکە بۆچی بە خراپی بەکاردەهێنرێت؟

جوانی ئافرەت تەنهـا بۆ دەرەوەیە، نەك بۆ هاوسەران!

سـەرەتا پیرۆزبایی خۆم ئاراسـتەی سـتافی گۆڤارەکەمان دەکەم، بە بۆنەی چوونە نێو سـاڵێکی نوێوە دەستخۆشی لـە هەمـوو کارمەنـدانو نووسـەرانو خوێنەرانـی بریـار دەکـەم، هیـوادارم سەرکەوتوو بن.

جوانی ئافرەت بەخششـێکی خودای گەورەیـە، ئافرەتی بە جوانترین دیمەن دروسـتکردووە، کـە دەبوایە هەمیشـە سوپاسـگوزاری خودا بێتو پاشـان زۆر بـە ژیریـیو وریاییەوە ئـەو بەهرەیە بپارێزێت لەو شـتانەی کە جوانییەکەی لە کەدار دەکەن. لە هەمان کاتدا جوانی ڕەوشـتو هەسـتو سـۆز گرنگتـرە لە جوانی ڕووکەش بۆ ژیانی هاوسـەرێتی، بە ڕاسـتی جوانی ڕووخسـار شـتێکی کاتییە، ئەگەر جوانی دەروونو دڵپاکیو ئاسـوودەیی لەگەڵـدا نەبێـت، زۆر بە ئاسانی بەرەو نەمان دەچێت.

بۆیە زۆرجار جوانی ئافرەت بووەتە کێشـەیەکی سـەرەکی نێوان هاوسەران، چونکە ئەو جوانییە زۆرجار هاوسەران بە شێوازێکی هەڵە بیری لێدەکەنەوە.

زۆرێك لەو ڕووداوانەی کە گوێبیستی دەبین سەرنجی ڕاکێشام کە لەم ژمارەدا بـاس لە ئیرەییو دڵپیسـی هاوسـەران بکەم.

بـە کورتی ئـەو کەسـانەی ئیرەیی (غیرە)یـان هەیە سـەبارەت بە جوانی خێزانەکانیان، دەکرێن بەسێ بەشەوە:

* ئیرەییو دڵپیسـی لە ڕادەبەدەر: ئەو هاوسەرەیە هەمیشە هونەر دەنوێنێ لە گومانو بـێ متمانەیی لە دەربڕینی هەڵوێسـتەکانیدا، ئەمەش بـە زیندانی کـردنو بـەردەوام چاودێریکردنـی خێزانەکەی لە هەموو کردارو گوفتارێکدا. تەنانەت ڕازی نەبوون بە دەرچوونی لە مـاڵو تەماشـاکردنی دەرەوە تەنانـەت لە پەنجەرەشـەوە، واتە بە شـێوەیەکی گشتی گەمارۆدانی ئافرەتەکە لە هەموو ڕوویەکـەوە، بەداخەوە ئەمە هەڵەیەکی زۆر نەفامانەیـە چ لە ڕووی ئاینییەوەو چ لە ڕووی ژیرییەوە، بێگومان ئەنجامی ئـەم جـۆرە هەڵسـوکەوتە هـەردوولاو بەتایبەتیش ئافرەت تووشـی نەخۆشی دەروونـیو بێـزاری دەکات، هـەر بۆیە ئەو جوانیو سـیمایەی کە هاوسەرەکەی لـە پێناویـدا زیندانـی دەکات دەبێتە دوژمنێکی سەرەکی بۆ ژیانی!

بەڵگـەی ڕاسـتمان بۆ ئـەم بابەتە چیرۆکێکـی ڕاسـتەقینەیە کـە لەزاری ئافرەتێکـەوە دەیگێڕینـەوەو دەڵێـت: (مـن قوتابـی زانکۆ بووم زۆر هەسـتم بە ئاسودەییو خۆشحاڵی دەکرد، لە نێو خێزانەکەمـدا هیـچ فێـری کۆتکردنو زیندانکردن نەببووم، هەمیشە لە زانکۆ کوڕێـك هەبـوو زۆر سـەرنجی دەدام، بەردەوام چاوی لەسـەرم بوو، بێئەوەی قسـەم لەگەڵـدا بـکات، ڕۆژێـك دوای گەڕانەوەم بـۆ ماڵەوە بینیم باوکی ئەم کـوڕە هاتووە بـۆ خوازبێنیـم، ئەوەی کەمنی دڵخۆشـکرد ئەم کوڕە لەو کەسە دەچـوو کە من چاوەڕوانـی بووم، وەك چۆن بڵێم کەسـێکی لێزانو تێگەیشتوو، واتـە بەشـێوەیەك خـۆی دەرخسـت هەمـوو ئـەو سـیفەتانەی تیادایە کە مـن چاوەڕوانیـم دەکـرد! هەرچەندە داواکاریم زۆر بوو، بەڵام بەم داخوازییە ڕازیبووم، پاش بەسـەربردنی ماوەیەك لـە دەسـتگیرانیمان بێئـەوەی بە هیچ شـێوەیەك سیفەتو هەڵسوکەوتی خۆیم بۆ باس بکات، بەڵام پاش هەفتەیەکمان لە ژیانی هاوسـەرێتی هەموو یاساکانی بەسـەرمدا جێبەجێکـرد، بـۆی ڕوون

کردمـــەوە کە بە هیچ شـێوەیەك ڕازی نییە بچمە دەرەوە، پاشـان وەسـتان لە لای پەنجەرە، تەنانەت وایلێکردم واز لە زانکۆ بهێنم، پاشـان سەردانی کەسوکار قەدەغەیە بەبێ ئەو!!

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بڕیارو قەدەغەکردن زیـادی دەکرد، بـەردەوام بەو قسـەیە بێدەنگی دەکردم دەیگووت: تۆ ئافرەتێکی جوانو بە نرخی، پێویسـتە لەسەرم لە چاوی کەسـانی خـراپ بتپارێزم! بۆیە هەمیشـە حەزم دەکرد دەمو چاوم وەك خەڵـوز ڕەش بووایـە، بـەس زینـدان نەبوومایـە، هیـچ متمانەیەکم نەمابوو بە خۆم، واهەسـتم دەکرد من کەسێکم لە ڕووی خوڕەوشتمەوە تەواو نیم، هەتا بـەو جـۆرە چاودێریم لەسـەرە، داوای جیابوونـەوەم کرد، بـەڵام ڕازی نەبوو، ئەو خۆشەویسـتیو دڵسۆزی دەنواند بۆ کارەکـەی، بۆیـە ناچار ڕۆژێـك لە ماڵ دەرچـووم‌و گەڕامـەوە بـۆ لای کەس‌و کارم‌و هەتا ئێستا چاوەڕوانم کە تەڵاقم بدات، بەڵام ڕازی نابێت.

جـۆری دووەمـی ئیرەیـی (ئیـرەی پێویست): ئەمجۆرە کەسانێکی تێگەیشتوون بـە پێچەوانـەی جـۆری یەکەمـەوە، بە شـێوەیەکی لێزانانەو ژیرانـە ئامۆژگاری خێزانەکانیـان دەکـەن لـە ڕووی دیـن‌و ئەقڵـەوە کارە ڕاسـتو ناڕاسـتەکانیان بۆ ڕوون دەکەنـەوە، لـە هەمـان کاتـدا کار بـە ئایەتـە پیـرۆزەکانو فەرموودەکانی پێغەمبەری خودا دەکەن، جوانیو زینەتی خێزانەکانیان دەپارێزن لە ترسـی خودا تا بەرەکەتو پیـرۆزی بکەوێتە نێو ژیانیان. جوانتریـن بەڵگەیـان ئـەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: (ولایبدین زینتهن إلا ماظهر منها). پێویستە لەسەر ئافرەتان گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانیان بن، بەشێوەیەك خۆیان دەرنەخەن کە جێگای سـەرنجی کەسـانی نامەحرەم بن، وەك پێویسـت لە کۆتاییدا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

جۆری سێیەم (ئیرە یی نەخۆشی) بە داخەوە ئەم جۆرە هاوسەرانە لێکۆڵەرەوەکان بە کەسانی نەخۆشییان لە قەڵەم دەدەن، لە جـۆری یەکەم خراپترەو زۆر بە دڵڕەقیو سەرکەشـیانە مامەڵـە دەکات، وادەزانێت ئەگـەر خێزانەکـەی بـەردەوام لـە ژێر چاودێـری ئەودا نەبێت تووشـی خیانەت دەبێـت، بەردەوام لـە دڵەڕاوکێو گومانی خراپـدا دەژی، حـەز نـاکات خێزانەکەی تەنانەت باسـی براو باوکی بـکات، ئاواتە خوازە واز لە هەموو کەس‌و کاری بهێنێت، پاشان هەموو کەلوپەلو پێداویستییەکانی خێزانەکەی لە ژێر چاودێری ئەمدا بێت، لەگەڵ ئەوەشـدا لە لای خەڵکی هەسـتی خێزانەکەی دەشـکێنێتو گومانی خراپی پێدەبات.

خـوای گـەورە هەمووان بـە دوور بگرێت لەم نەخۆشییەو چارەسەری ئەو کەسانە بکات کە تووشی ئەم نەخۆشییە بوون بە ڕاستی ژیان بەسەربردن لەگەڵ ئەو جۆرە کەسـانەدا زۆر زەحمەتە! بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشییە هەمیشە ئەم فەرمـوودە جوانەی پێغەمبـەری ئازیز (درودی خـوای لەسـەر بێـت) بهێنینە یادمان: (إن من الغیره مایحبه الله، ومنها مایبغضه الله، وأما الغیرەالتی یحبهاالله، فالغیره فی الریبه، والغیره التی یبغضها الله، فالغیره فی غیر ریبه)).

ئـەوەی کە جێـگای سـەرنجە زۆرێك لەو کێشـانەی کە ڕووبـەڕووی خێزانەکان دەبنـەوە جوانیو جوانـکاری ئافرەتان لە شـێوەو جـلو بەرگدا بـۆ دەرەوە نەك بۆ هاوسـەر، ئەمەش کێشـەیەکی سـەرەکییە کە زۆرجار هاوسـەران بە هـۆی ئەمجۆرە ڕەفتارە تووشی ئیرەیی دەبن، هەروەك لە سەرەتا کورتە ئاماژەیەکمان پێکرد، لەبەر تێکەڵنەکردنی جۆرەکانی ئیرەیی حەزمکرد بە بابەتێکی سەرەکی باسی لێوە بکەم.

هەروەك دەزانن بە داخەوە ڕێژەیەکی زۆری ئافرەتان دەتوانم بڵێم: لە (٧٥٪)ی ئافرەت، ئـەو بایەخەی کـە بە کڕینی پێداویسـتی دەرەوە لـە جلوبـەرگو پێداویسـتییەکانی جوانـکاری دەدات، بایەخ نادات بە پێویستی نێوماڵ، لەگەڵ ڕێزمدا هیچ کات لەگەڵ ئەو کەسـانەدا نیم بە شێوازێکی ناڕێك دەچنە دەرەوە، بەڵام بایەخدان بە شێوازی جلوبەرگو خۆڕازاندنـەوە بـۆ ماڵـەوە، بێگومـان هاوسـەر ئیرەیـی پێویسـت نـاکات بە غیرەی لە ڕادەبەدەر! چەندەها هاوسەر هەیـە بە ئامـۆژگاری جـوان، یا دیاری کڕینو هاندان هەوڵی داوە جلو بەرگـو شـێوەی خێزانەکەی بگۆڕێت، بەڵام بە هۆی گوێڕایەڵی نەکردنی خێزانەکەیەوە، ئەمیش گۆڕاوە لە کەسـێکی ئاساییەوە بۆ کەسێکی تووڕەو نەخۆش!

ئازاد محێدین



# من کرێکارم

پێشکەشـە بە تـەواوی کرێکارانی جیهان

من کرێکارم

مـن کرێکـارم، خوازیاری کارم باوەڕم وایـە، من لە بۆ کارم کار پێناسـەمە، پێناسـەم کارە دژی بێکاریـم، دەردی هەژارە جێنشـینێکی، پەروەردگـارم ئاوەدان خوازو ئـاوەدان کـارم عەرەق ئەڕێژم، لە تۆزو گەردا لەنـاو زایەڵەی، ئاسـنو بەردا مـن کاتم ئەوێ، بۆ کارەکانـم من بە کات نـاڵێم، کارێ نـازانم ئەمن دەستپاك و بێ غەشو فێڵم بە دوای ئارامـی، خەڵکیدا وێڵم هەر چەنـدە کرێم، ناگاتە کارم شـانازی ئەکەم، کە کرێـکارم کۆشـكو تەلارو پـردو ڕێگاوبان کەرەستەی زەویو دەریاو ئاسمان تەواوی ئامێـر، خۆراكو بەرهەم ژێر خانو سەرخان، ئابوری سەرجەم هەمووی بەرهەمی، دەستی کرێکارە کرێی کرێکار، لای پەروەردگارە یەکی ئایاریش، نـاوەسـتم لە کار پیـرۆز تر ئەکەم، ڕەنجی کرێکار

ئا: بەرزان ئەبوبەکر

# دەتوانین یەکتریمان خۆشبوویت؟

ژنو مێردێکی بەساڵاچوو، کە تەنها خاوەنی یەك کوڕ بوون، ئەویش سەرباز بوو، ماوەیەکی زۆر بوو پەرۆشی بیستنی هەواڵی کوڕە تاقانەکەیان بوون، لە مێژ بوو چاوەڕوانیان دەکرد کەسێك لە دەرگا بداو ئەمانیش بە هەڵەداوان بڕۆن دەرگاکەی لێ بکەنەوەو بە توندی لە ئامێزی بگرن، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ساتێك بەردەوام چاوەکانیان لەسەر ئامێری تەلەفۆنەکە بوو، چاوەڕێیان دەکرد هیچنا کوڕەکەیان تەلەفۆنێکیان بۆ بکاتو گوێبیستی هەواڵو بارودۆخی بن، ئەو بەیانییە بە زەنگی تەلەفۆنەکە بە خەبەر هاتن، پێشبڕکێیان کرد بۆ وەڵامدانەوەی، پیرە پیاو خۆی گەیاندە تەلەفۆنەکەو ئەلو.. ئەلوو.. کێ قسە دەکات؟ وەڵامی دایەوە، بابە گیان من (کلارك)م، حاڵتان چۆنە؟

پیرەپیاو بە چاوی پڕ لە ئەسرینەوە: دەبێت لە دووری تۆ حاڵمان چۆن بێت؟! تۆ چۆنی کوڕە شیرینەکەم؟ کەی دەگەڕێیتەوە بۆ لامان؟ دایکیشی ئۆقرەی نەگرت تا کوڕەکەی وەڵام بداتەوە، بە دەنگێکی پڕ لە سۆزەوە وتی: تاقانەکەم حاڵی تۆچۆنە؟ سەلامەتی؟

(کلارك): بەڵێ، دایەگیان من زۆرباشم، بە پشتیوانی خودا چەند ڕۆژێکی تر بە نیازم بگەڕێمەوە..

بە بیستنی ئەم هەواڵە ئەوەندە دڵخۆش بوون، کە وێنا ناکرێت، باوکی وتی: کوڕم بە ڕاستی دەگەڕێیتەوە بۆ لامان، منو دایکت زۆر پەرۆشی بینینی چاوەکانی تۆین، لە دووری تۆ ئاراممان لێبڕاوە!

کلارك: لە ڕاستیدا ئێستا کێشەیەکم بۆ هاتۆتە پێش، بۆیە ناتوانم بگەڕێمەوە بۆلاتان، هاوڕێیەکی زۆر ئەزیزم لە شەڕەکەدا هەردوو دەستیو قاچی ڕاستی لە دەستداوە، زۆر بە ناڕەحەتی دەتوانێت بجووڵێتو قسە بکات، ئایا دەتوانم لەگەڵ خۆمدا بیهێنمەوە بۆماڵەوە؟

باوکی وتی: لەگەڵ خۆتدا بیهێنیتەوە؟

بەڵێ، چونکە من ناتوانم جێیبهێڵم، ئەویش نایەوێت بەو شێوەیە بگەڕێتەوە بۆ ناو کەسوکارەکەی، بەو حاڵەوە توانای بینینی ئەوانی نییە، بەردەوام دەپرسێت ئاخۆ کەس‌وکارم منیان بەو حاڵەوە قبوڵە، یا نا؟

باوك: کوڕی شیرینم، تۆ چیت لەو دەردەسەرییە داوە، وازی لێبێنە، با نەخۆشخانە خۆیان سەرپەرشتی بکەن، چونکە ئەگەر تۆ لەگەڵ خۆشتدا بیهێنیتەوە، کێ دەتوانێت وەها کەسێك خزمەت بکات؟ کێ ئامادەیە لەگەڵ کەسێکدا ژیان بگوزەرێنێت کە هەردوو دەستیو قاچێکیشی نەبێت؟ کوڕم، گوێت لێمە؟ لەسەر هێڵ ماویت؟ بۆ وەڵام نادەیتەوە؟

کلارك: بابەگیان گوێم لێتە، ئایا ئەوە دوابڕیارتە؟

بەڵێ، کوڕە ئەزیزەکەم، پەیوەندی بکە بە یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەیەوە، بۆئەوەی بێن بە دەم کوڕەکەیانەوەو بیدەرەوە دەستی کەس‌وکارەکەی؟

کلارك: لەو باوەڕەدایت هیچ کام لە ئەندامانی خێزانەکەی ئەم کوڕە بەو




حاڵەوە قبوڵ بکەن؟

باوك: لەو باوەڕەدا نیم، هیچ کەس لە ئەوان بتوانێت ئەو بەرپرسیارێتییە سەختە بخاتە ئەستۆی خۆی!

کلارك: زۆرباشە بابەگیان، ئێستا کاتی ماڵئاواییە، خۆشحاڵ بووم گوێم لە دەنگتان بوو، بە هیوای دیدارتان! خواتان لەگەڵ!

دوای تێپەڕبوونی دوو ڕۆژ بەسەر ئەم گفتوگۆ تەلەفۆنییەدا، سەربازەکان تەرمی (کلارك)یان، لە ناو ڕووبارەکەدا دۆزییەوە، دوای ئەوەی توانیبووی لە نەخۆشخانەی سەربازی ڕابکات، لەسەر یەکێك لە پردەکانەوە خۆی هەڵدابووە نێو ئاوەکەو کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنابوو..

بۆ جاری دووەم زەنگی تەلەفۆنەکە دوای دوو ڕۆژ لێدرا، بەڵام ئەمجارەیان کلارك نەبوو، بەڵکو بانگهێشتی باوکی کلارك کرا تا بچێت تەرمی کوڕەکەی وەربگرێتەوە، کاتێك تەرمی کوڕەکەی بینی تووشی شۆك بوو، چونکە کلارك هەر دوو دەستیو قاچی ڕاستی نەبوو، باوکی تێگەیشت ئەو کەسەی کلارك باسی دەکرد هاوڕێی کلارك نەبوو، بەڵکو کلارك خۆی بوو، هەردوو دەستو قاچی ڕاستی لە دەست داوە! ویستوویەتی هەڵوێستی دایكوباوکی سەبارەت بە وەها کەسێك بزانێت، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ناویان!

چیرۆکی ئەم باوکە لە ژیانی زۆرێك لە ئێمە دەچێت، چونکە ئێمە کەسانی دەوروبەرمان لەبەر خۆیان خۆشناوێت، بەڵکو لەبەرئەوەی شۆخو شەنگن، یان شێوەو باڵاو ڕووخساریان جوانە، لەبەرئەوە هەرگیز ناتوانین (کەسە ناتەواوەکانمان خۆشبووێت) جا ئەو ناتەواوییە لە شێوەو ڕووخساردا بێت، یان لە سروشتو نەریتو هەڵسوکەوتیاندا بێت.

هەر بۆیە پێویستە ئەوە بزانین کە هەر کات باسی کەسێکی کەمئەندام، یان ناتەواو لە شێوەو ڕووخسارو هەڵسووکەوتدا کرا، دەبێت هەمیشە خۆمان بێتەوە یاد لەسەر ئەو حاڵەتە، واتە ئەگەر تۆ ئەو ڕووداوە، یا کارەساتەت بەسەردا بێت، حەزدەکەیت کەسوکارو دۆستانت چۆن مامەڵەت لەگەڵدا بکەن؟

با هەمووان ئەم دروشمە بکەینە سەرمەشقی ژیانمان: (ئەوەی بۆ خۆت پێتخۆشە، پێویستە بۆ کەسانی دەوروبەریشت پێخۆش بێت)!

ژیان فێری کردم: دوێنێ ئەو چەکە بانکییەیە کە ڕاتکێشاوە، سبەینێش ئەو چەکە بانکیەیە کە دواخراوە، بەڵام ئێستا تاکە چەکی بانکییە کە لەبەردەستدایە، لەبەرئەوە پێویستە بە دانایيو کارزانی خەرجی بکەیت.

ژیان فێری کردم: ئەو کەسەی دەیەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، پێویستە لە هیچ شتێك نەترسێت جگە لە ترس!

ژیان فێری کردم: ئێمە وەکو خۆی لە جیهان ناڕوانین، بەڵکو وەکو خۆمان لە جیهان دەڕوانین!

ژیان فێری کردم: هەر کەسێك نەتوانێت کۆنترۆڵی کاردانەوەی خۆی بکات، دەکەوێتە ژێر ڕکێفی کەسانی دیکەو بارودۆخەوە!

ژیان فێری کردم: لە ناپلیۆنیان پرسی: چۆن توانیت متمانە بەخۆبوون لە دەروونی سوپاکەتدا بچێنیت؟

لە وەڵامدا گوتی: بەردەوام بە سێ وشە وەڵامم دەدانەوە:

ئەوەی دەیگوت: ناتوانم، پێم دەگوت هەوڵبدە!

ئەوەی دەیگوت: نازانم، پێم دەگوت فێربە!

ئەوەی دەیگوت: مەحاڵە، پێم دەگوت تاقی بکەرەوە!

ژیان فێری کردم: سەرکەوتن پێویستی بە بوێریو جەربەزەیی هەیە، چونکە کەسانی شەرمن، لەم ژیانەدا زۆر پێش ناکەون!

ژیان فێری کردم: سەرەڕای ئەوەی مرۆڤ تەنها یەکجار دەژی، ئەو کەسەی گەرموگوڕ(حماسە) نییە ژیانی لا خۆش نییە، بەم بیرۆکەیەش ژیان لە خۆیان تێکدەدەن، هەر ئەمەش جیاوازی نێوان گەشبینو ڕەشبینە، ڕەشبین گەرموگوڕ نییە، ئەوەش واتە بەختەوەر نییە، بەڵام گەشبین گەرموگوڕی لە هەموو لایەنەکانی ژیانییەوە هەڵدێت، بەمەش دەبێتە مرۆڤێکی بەختەوەر، لە هەموو بارودۆخێکی ژیانیدا!

ژیان فێری کردم: هەموو ئەو شتانەی ڕووبەڕوومان دەبنەوە، جیاوازی دروست ناکەن، بەڵکو ئەوەی جیاوازی دروست دەکات چۆنییەتی هەڵسوکەوتمانە لە بەرامبەر ئەو شتانەی ڕووبەڕوومان دەبنەوە!

ژیان فێری کردم: هەرگیز ژیری لەگەڵ حەسودیو ئیرەییدا کۆنابنەوە، ئەو کاتەی حەسوودی، یان ئیرەیی هەبوون، توانای ڕازیکردنی کەسی حەسوود کەم دەبێتەوە!

ژیان فێری کردم: ئەو کەسەی بەدوای هاوڕێی بێ کەموکورتیدا بگەڕێت، سەرەنجام بێ هاوڕێ دەمێنێتەوە.







له سەردەمانی کۆندا پاشایەکی ئێجگار دەسەڵاتدار هەبوو، ئەم پاشایە ماوەیەکی زۆر بیری لە سێ پرسیار دەکردەوە کە هەمیشە مێشکی خرۆشدەدا: ئەگەر بزانم، گونجاوترین کات بۆ دەسپێکردنی کارێك چ کاتێکە؟ پێویستە گوێ لە قسەی کێ رابگرمو لە کێ دوورە پەرێز ببم؟ باشترین کار کامەیە بۆ ئەنجامدان؟ ئەوا هەرگیز تووشی هەڵە نابم.

بە فەرمانی پاشا، هەواڵی ئەم پرسیارانە بە هەموو مەملەکەتدا بڵاوکرانەوە. بڕیاری دا خەڵاتی شیاو بداتە هەرکەسێك بتوانێت وەڵامی دروستی ئەو سێ پرسیارە بداتەوە.

زانایان کە ئەم دەنگوباسەیان بیست، دەستە دەستە هاتنە خزمەتی پاشا، بەڵام هەریەکەیان بیروڕای جیاوازی هەبوو سەبارەت بە پرسیارەکان.

کۆمەڵێك لە زانایان وەڵامی پرسیاری یەکەمیان بە شێوەیەك دایەوە کە رۆژمێرێکیان بە پێی ساڵومانگو رۆژ ئامادە کردو پێشکەشیان کرد.

ئەگەر بەرێكو پێکی بەکاری بهێنێتو پەیرەوی بکات، ئەوا هەموو کارەکانی لە کاتی گونجاودا جێبەجێ دەکات.

بە بۆچوونی کۆمەڵێکی دیکە، هەرگیز ناکرێت پێشوەخت بزانرێت گونجاوترین کات بۆ ئەنجامدانی هەرکارێك چ کاتێکە، بۆیە لە بری ئەوەی خۆی بە شتی بێ ماناوە خەریك بکەیت، باشتر وایە بە وردی سەرنجی رووداوەکانی دەوروبەر بدرێت، هەرشتێکیش کە پێویست بوو بە بێئەوەی کات بە فیرۆ بدرێت جێبەجێ بکرێت ئەمە باشترین چارەسەرە..

بەشێکی تری زاناکان پێیان وابوو کە "تەنیا کەسێك چەندە بە وردی ئاگاداری رووداوەکانی دەوروپشتی ببێت با ببێت، هێشتا ناتوانێت بە تەنیا بڕیاری باشترین کات بۆ ئەنجامدانی هەرکارێك بدات، "لەبەرئەمە ئامۆژگاری ئەمان پێکهێنانی دەستەیەك زانایان بوو بۆ ئەوەی ببنە یاریدەدەری پاشا لە کارەکانیدا.

دواین گروپ بەرپەرچی ئەم دەستەیەی پێشتریان بەوە دایەوە کە دەکرێت بەر لە هەرکارێك کاری گونجاوی بۆ دیاری بکرێت، وتیان: "دەتوانرێت بڕیار لەسەر کاتی گونجاو بدرێت، بەڵام بۆ ئەمە، دەبێت ئەو کەسە پێش وەخت بزانێت چی روو دەدات، ئەمەش تەنها کاهینەکان دەیزانن، بۆیە پرسوڕا لەگەڵ کاهینەکاندا تەنها ڕێگایە.

بۆ هەڵبژاردنی کاتی گونجاو:

بۆ پرسیاری دووەمیش، وەڵامی هەمە جۆری بەم شێوەیان دایەوە:

هەندێك لە زاناکان، یارمەتیدەرانی پاشا، کاهینەکانو هەندێکی تریان زانایان پێ پەسەند بوو. لەگەڵ ئەمەشدا بەشێکیان پیاوانی ئاینیان بە باش دەزانی بۆ ئەم کارە. گروپێکی تر وتیان: "پزیشکەکان"، کۆتا گروپ وتیان: "نا، سەربازەکان گونجاون".

بۆ وەڵامی پرسیاری سێیەم، هەندێکیان پێیان وابوو، گرنگترین کاری دنیا (زانستە)، هەندێك (جەنگ)، ئەوانی تریش وتیان گرنگترین کار لە دنیا خۆ خەریککردنە بە پەرستنی خواوەندو لە پێناو بە دەستهێنانی ڕەزامەندی پەروەردگارو چونە بەهەشت.

لە کۆتاییدا پادشا ڕایگەیاند لەبەرئەوەی پێشنیارەکان هیچ کامێکیان لەگەڵ ئەوەی تر یەك ناگرێتەوە، بۆیە هیچیانی بە دڵ نەبوو، خەڵاتەکەش نادرێت بە کەس. پادشا هێشتا وەڵامی دروستی چنگ نەکەوتبوو، بۆیە بڕیاری دا پرسوڕا بە زانای دینداری بە ناوبانگ بکات.

ئەم پیاوەی کە پادشا دەیەوێت پرسی پێ بکات لە دارستانێکدا بە تەنیا دەژیا، هەرگیز لە دارستانەکە نەدەچووە دەرەوە، تەنها ڕێگە بە کەسانی ئاساییو سادە دەدات کە بێنە لای، بۆیە خاوەن شکۆ جلوبەرگی خۆی گۆڕیو بەرگی سادەی هەژارانی پۆشیو چووە سەردانی. کەمێکی مابوو بگاتە کوخی زاناکە، لە ئەسپەکەی دابەزیو فەرمانی بە پاسەوانەکان دا کە لە دواوە بمێننەوەو چاودێری بکەن، خۆی بە تەنیا بەردەوام بوو. کاتێك کە پادشا بەرەو لای دەهات، حەکیمەکە خەریکی کێڵانی باخچەی بەردەم کوخەکەی بوو. کە پادشا چاوی پێکەوت، سەلامی لێکرد، ئەویش وەڵامی دایەوەو پاشان دەستی بە کارکردن کردەوە. کابرای دانا، هێندە لاوازو بێ هێز بوو کە هەر جارێك پاچەکەی لە زەوی دەدا، تەنیا تۆزێك لە خاکەکەی هەڵدەکەندو بە تەواوی ماندوو دەبوو.

پادشا لێی نزیك بوویەوەو لێی

پرسی:

ئەی کەسی داناو زانا... هاتوومەتە لای جەنابت، بۆ ئەوەی وەڵامی سێ پرسیارم بدەیتەوە.

یەکەم، بۆ ئەنجامدانی هەرکارێك، گونجاوترین کات چ کاتێکە؟

دووەم: بۆ هەر کارێك گونجاوترین کەس کێیە؟ پێویستە زیاتر گوێبدەمە قسەی کێ و لەگەڵ کێ دەست لە ناو دەست کار بکەم؟

سێیەم: گرنگترین کار چییە؟ کام کار لەوی دی پێشتر ئەنجام بدەم باشترە...

زاناکە سەرەڕای ئەوەی گوێی هەڵخستبوو بۆ قسەکانی پادشا، بەڵام وەڵامی نەدایەوە، پاچەکەی گرتەوە دەستو درێژەی بە کارەکەی دا. پادشا پێی وت:

-جەنابت ماندوو بوویت، پاچەکە بدە بە من، با کەمێك هەڵکەنم. داناکە لە وەڵامدا:

-سوپاس، لەشتساغ بێت.

ئەمەی گوتو پاچەکەی دایە دەستی.

پادشا دوو، سێ پاچی وەشاندو دیسان پرسیارەکانی لێ دووبارە کردەوە.

زاناکەش ئەمجارەش وەڵامی نەدایەوەو هەستایە سەرپێ، دەستی بۆ پاچەکە کێشاو وتی:

- ئێستا تۆ پشوویەك بدە با من هەڵی بکەنم.

بەڵام پادشا پاچەکەی نەدایەوەو بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی... بەمجۆرە کاتژمێرێك تێپەڕی، کاتژمێرێکی تر... کات زۆر درەنگی کردبوو، تیشکی خۆر وردە وردە لە نێوان گەڵای درەختەکان بزر دەبوو.

پادشا تۆزێکی تر پاچی وەشاند، لە کۆتاییدا کەوتە سەرزەوی:

- ئەی زانا، بۆ وەرگرتنی پرسیارەکانم هاتوومەتەلات، ئەگەر وەڵامم نادەیتەوە با مـن بگەڕێمەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی هاتوم.

زاناکە بە دەستی ئاماژەی کردو وتی:

- سەیرکە، کەسێك بە ڕاکردن بەرەو ئێرە دێت، دەبێت کێ بێت؟ بابزانین کێیە.

کە پادشا تەماشای کرد، بینی کەسێك بە ڕاکردن لە دوورەوە ڕاست بەرەو ئەمان دێت. کابرا دەستی گرتبوو بە سکییەوە، خوێنی لێ دەچۆڕا. کە گەیشتە لای پادشا، چاوی تێبڕی، لەپڕ لە هۆش خۆی چوو، کەوتە سەرزەوی. زاناکەو پاشا جلەکانی غەریبەکەیان لابرد، برینێکی زۆر گەورەو قوڵ لە سکیدا هەبوو. پاشا ئەوەندەی لێ دەزانی برینەکەی پاکژ کردەوە بە دەستەسڕەکەی خۆی و خاولی زاناکە، سەری برینەکەی پێچا.

بەڵام هەرچی دەکرد خوێن بەربوونەکەی نەدەوەستایەوە، چەندجارێك پاشا پەڕۆ خوێناوییەکەی دەشوشت، بەڵام دیسان خەڵتانی خوێن دەبووەوە. لە کۆتاییدا کە خوێنەکە وەستایەوە، زامدارەکە هاتەوە هۆش و داوای ئاوی کرد.

پاشا ئاوی هێناو دای بە بریندارەکە. ئەو کاتە لەبەرئەوەی ڕۆژئاوا بوو، هەوای سارد کردبوو، بۆیە پاشا بە یارمەتی زاناکە بریندارەکەی بردە ناو کوخەکەوەو خستیانە سەرجێگە، خەوێکی قوڵی لێکەوت. هاوکات پاشا دەرئەنجامی زەوی کێڵان و تیمارکردنی بریندارەکە هێندە ماندوو ببوو، کە هەر لەبەر دەرگاکە خەوی لێکەوت.

لەو شەوە کورتەی هاویندا، پاشا بەبێ ڕاخەرو نوێن تا بەیانی بە ئارامی نوست، ڕۆژ بووەوە، هەرچی دەکرد نەیدەزانی لە کوێ و ئەو بریندارە چاو بزەی کە زۆر بە وردی تەماشای دەکرد نەیدەناسییەوە، کابرای بریندار کە بینی پادشا بە خەبەرهاتووەو سەیری ئەم دەکات، بەدەنگێکی لەرزۆك وتی: لێم خۆش دەبیت؟ پاشا لە وەڵامدا چی بووە تا لێت خۆش ببم؟ خۆ هەرناشتناسم! جەنابت من ناناسیت، بەڵام من ئێوە دەناسم، فەرمانی لە سێدارەدانی براکەمتان دەرکردو هەموو ماڵو سامانەکەشتان برد، منیش نەزرم کردبوو، تۆڵەتان لێ بسەنمەوە، بەوەم زانی بوو کە بە تەنها دەچن بۆ لای زاناکە، بۆیە بڕیارم دا کە گەڕایتەوە، بتکوژم، بەڵام لەبەرئەوەی بە درێژایی ڕۆژ نەگەڕایتەوە ناچار لە حەشارگەکە هاتمەدەرەوەو دەستم کرد بە گەڕان بە دواتدا، کە دەهاتم لە ڕێگا تووشی کاروانی پاسەوانەکان بووم، منیان ناسی، برینداریان کردم، توانیم لە دەستیان دەرباز بم، بەڵام لەبەر سەختی برینەکەم نەمتوانی لەوە زیاتر بڕۆم، ئەگەر ئێوە برینەکەتان نەپێچایە خوێنم تێدا نەدەماو دەمردم، من ویستم ئێوە بکوژم، بەڵام ئێوە ژیانی منتان ڕزگارکرد، ئەگەر لە ژیانمدا مامەوەو ئێوە ڕازی ببن دەبم بەڕاستگۆترین خزمەتکاری جەنابتو خزمەتتان دەکەم، فەرمان بە نەوەکانیشم دەدەم کە هەمان کار بکەن، تکا دەکەم لێم خۆش ببە؟ پادشا زۆر دڵخۆشبوو بەوەی لەگەڵ دوژمنەکەیدا بەو ئاسانییە ئاشت بووەتەوەو بووە بە دۆستی. هەر بەوەوە نەوەستا لێی خۆش بێت، بەڵکو بڕیاری دا هەموو سامانی براکەی بۆ بگەڕێنێتەوە، بۆ خزمەتکردنو چاکبوونەوەشی لە باشترین خزمەتکارەکانی خۆی بۆ دابین بکات.

پادشا داوای یارمەتی لە بریندارەکە کردو خوا حافیزی لێکرد، بۆ بینینی زاناکە چووە ناو باخچەکە، ویستی بەرلەوەی بەجێیان بێڵێت، بۆ دواجار پرسیارەکانی لێ بکاتەوەو وەڵامەکەی لێ وەربگرێت. زاناکە سەرقاڵی تۆو وەشاندنی ئەو باخچەیە بوو کە دوێنێ بە هاوکاری پادشا کێڵا بووی. پادشا لێی نزیکبووەوەو وتی: ئەی زانا! بۆ دواجار داوات لێدەکەم، وەڵامی پرسیارەکانم بدەیتەوە. زاناکە لەسەر پووزە لاوازەکەی چیچکەی کرد، سەری هەڵبڕی و سەیرێکی پادشای کرد: خۆ تۆ وەڵامی خۆتت وەرگرتووە، پاشا سەری سوڕماو پرسی: ئاخر چۆن؟

کام وەڵامە؟ دەتەوێت بڵێی چی؟ زاناکە: ئێستاش تێناگەیت؟ دوێنێ ئەگەر بەزەییت بە لاوازی مندا نەهاتایەتەوەو زەوییەکەت بۆ نەکێڵامایە، دەگەڕایتەوەو لە ڕێگا ئەو کابرایە بە ڕووتدا هەڵدەشاخا، ئەو کات پەشیمان دەبوویتەوە لەوەی کە لە لای من نەماویتەوە. واتا ئەو کاتەی زەوییەکەت تێدا هەڵدەکەند بۆ تۆ گرنگترین کات بوو، هەر لەبەرئەوە گرنگترین کەس بۆ تۆ من بووم، گرنگترین کاریش یارمەتیدانی من بوو.

دواتر، کە بریندارەکە ڕووی لە ئێمە کرد گوونجاوترین کات ئەو کاتە بوو کە چارەسەرت کرد، چونکە ئەگەر تۆ برینی کابرات نەپێچایە بە بێئەوەی ئاشت ببنەوە دەمرد، کەواتە گرنگترین کەس ئەو بوو، گرنگترین کاریش چارەسەری ئەو بوو. هەرگیز ئەوە لە یاد نەکەیت کە تەنها کاتێکی گرنگ هەیە، ئەویش (ئێستا)یە، چونکە تەنها لەو کاتەی تێیداین قسەمان دەڕوات. گرنترین کەس بۆ مرۆڤ ئەو کەسەیە لەو کاتەی تێیدایە دەبینێتو لەگەڵیدایە، ئەو کەسەی ئێستا لەگەڵماندایە، چونکە هیچ کەسێك نازانێت ڕۆژێك کاری دەکەوێتە کەسێکی تر، یان نا. گرنگترین کاریش چاکەکردنە بەرامبەر ئەو کەسەی لەو کاتەدا ڕووبەڕووی دەبیتەوە، چونکە ئامانج لە ناردنی مرۆڤ بۆ دنیا، تەنها چاکەکردنە.

# با چاکە کردنت بۆ خەڵکی نەبێت!!



بێگەرد فارس

پیاوێکی بە تەمەن کە لە لێواری مەرگ نزیك ببووەوە، ویستی کوڕە تاقانەکەی فێری پەندێك بکات، بۆیە داوای لێکرد کە هەرگیز چاکە لەگەڵ کەسدا نەکات!

پاش مردنی پیرە پیاوەکە، ڕۆژێك کوڕەکەی بۆ ڕاوکردن چووبووە دەرەوە، بە هۆی ماندوو بوونییەوە بۆ حەوانەوە لە پاڵ ئەسپەکەی ڕاکشابوو، هەڵۆیەکی برینداری بینی نەیدەتوانی بفڕێت، دڵی پێ سوتا هەڵیگرتەوە بۆئەوەی تیماری بکات، بردییەوە ماڵەوەو بڕیاری دا پاش چاکبوونەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ژینگەیەی کە تیایدا ژیاوە.

بۆ ڕۆژی دووەم وەکو هەمان ڕۆژی پێشوو بۆ ڕاوکردن گەشتی کرد بۆ ناو دارستانێك، پیاوێکی بینی لە هۆش خۆی چوو بوو، لە بن درەختێك کەوتبوو، دەستەکانی بەسترابوون بەزەیی پێدا هاتەوەو ئاوی کرد بە دەموچاویداو دەستەکانی کردەوە، هەر کە هۆشی هاتەوە بردییەوە ماڵەوەو زۆر گرنگی پێ دەداو هەر شتێك لە داوو دەرمانو خواردنو شوێنی حەسانەوە هەبوو بۆی ئامادە دەکرد.

بۆ ڕۆژی سێیەم دیسان بۆ کارەکەی چووە دەرەوە، ئەمجارەش مارێکی نەخۆشی بینی بە هەمان شێوە ئەویشی هەڵگرتەوەو بەرەو ماڵەوەی بردەوە بۆ چارەسەر!

هەڵۆکە چاك بووەوە، بەڵام هەر دەگەڕایەوە بۆ ماڵی ڕاوچییەکە، ڕۆژێك لە کاتی گەڕانەوەیدا ملوانەکەیەك کە لە مرواریو ئەڵماسو یاقوت دروستکرابوو، بە دەنووکەکەی هەڵیگرتبوو لە بەردەم هاوسەری ڕاوچییەکەدا بەری دایەوە، ئەویش زۆر دڵخۆشو بەختەوەر بوو، چونکە لە ژیانیدا شتی وا بە نرخی نەبووە، سەرەڕای ئەو نارەحەتیو هەژارییە زۆرەی چەشتبووی.

ئەو پیاوەی کە بۆ چارەسەر لە ماڵی ڕاوچییەکە مابووەوە چاوی لەم دیمەنە بوو، چاودێری دەکردن بۆئەوەی بزانێت چی ڕوو دەدات! پاش ماوەیەك بڕیاری دا بەڕێی خۆیدا بڕواتو زۆر سوپاسی هاوکاریو دڵسۆزی ڕاوچییەکەی کردو ڕۆیشت، لە ڕێگادا گوێی لە دەنگێك بوو هاواری دەکردو دەیگوت: ملوانکەی شاژن ونبووە، هەرکەسێك بیدۆزێتەوەو بیگەڕێنێتەوە ئەوا پاشای وڵات سەد لیرەی ئاڵتوونی پێدەبەخشێت! ئەویش لە دڵی خۆیدا وتی: سەد لیرەی ئاڵتوون!! منیش پیاوێکی هەژارو نەبووم، بێ دوودڵی بەرەو ماڵی پاشا بە ڕێکەوت، بۆئەوەی هەواڵی ملوانکەکەیان بداتیو ببێتە خاوەنی خەڵاتەکە!

بە خێرایی پیاوەکانی پاشا بەرەو ماڵی ڕاوچییەکە بەڕێکەوتن، (ئەو ڕاوچییەی ماڵەکەی خۆی کردە ئارامگەیەك بۆ چارەسەرو حەوانەوەی ئەو!)، کابرای ڕاوچی دەستگیرکراو بە دزینی ملوانکەی شاژن تۆمەتباریان کرد، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی فەرمانی لە سێدارەدانی بدرێت!

ئەو مارەی کە ڕاوچییەکە ڕزگاری کرد، بەم هەواڵەی زانیو ویستی خزمەتی خاوەنەکەی بکات، هەرگیز لە یادی نەکات بەرامبەر ئەو خزمەتە گەورەیەی پێشکەشی ئەوی کرد، کاتێك بە نەخۆشی لە دارستانەکە کەوتبوو!

مارەکە بەرەو کۆشکی پاشا بەڕێکەوتو چووە ژووری کچی پاشاو خۆی بە دەوریدا ئاڵاند، کاتێك شاژن ئەو دیمەنە ترسناکەی بینی دەستی بە هاوارکردن کردو بەرەو پاشا ڕۆیشت تا هەواڵی کچەکەیانی پێ بدات، بەڵام هیچ یەکێك لەوان نەیاندەوێرا ژیانی ئەو کچە ڕزگار بکەن، تەنانەت نزیکیشی نەکەوتنەوە!

هەموو بیریان دەکردەوە چۆن لەو

بارودۆخە ڕزگار ببن، یەکێك لە وەزیرەکان بیری کردەوەو وتی: گەورەم ئایا کەسێك لە زینداندا نییە بۆ ئەوەی لە سێدارە بدرێت؟! هەر ئەو ڕاوچییەی دزییەکەی کردبوو خۆ هەر دەمرێت ئیتر بۆچی ئەو نەیەت ئەو کارە بکات؟

بە هەر شێوەیەك بێت ئەو فەرمانی مردنی دەرچووە، ئەگەر مارەکەش پێوەی بدات هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت.

ئەویش بەوە ڕەزامەندی دەنوێنێتو داوا دەکات ڕاوچییەکە بهێنن بۆئەوەی بەو کارە هەستێت، پاش ئەوەی دەیهێنن پاشا پێی دەڵێت: کە ئەو کارە جێبەجێ بکات! ئەویش دەڵێت: باشە گەورەم من ئەو کارە دەکەم، بەڵام ئایا پاداشتت بۆم چی دەبێت؟ پاشاش دەڵێت: لێت خۆش دەبمو ملوانکەکەشت بە دیاری دەدەمێ.

ڕاوچییەکە چووە ژووری کچە پاشاوە، کاتێك مارەکە بینی یەکسەر بەرەو ڕووی ڕاوچییەکە هاتو لە کچەکە دوور کەوتەوە، ئەویش مارەکەی هەڵگرتو ملوانکەکەشی بە دیاری بۆ هاوسەرەکەی بردەوەو وتی: مارەکەو هەڵۆکە بە وەفا بوونو پاداشتی کارەکەمیان دایەوە، بەڵام پیاوەکە نەیتوانی ئەو یارمەتییە قەرەبوو بکاتەوە، سەرەڕای ئەوەش بێ وەفایی نواند بەرامبەر هەموو ئەو چاکەیەی بۆی کرا، ئەمە ئەو ئامۆژگارییە بوو کە باوکم لەسەرەمەرگدا پێی وتم: کە چاکە لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا نەکەم!

چاکەکردن بەو مانایەی بۆ پاداشتو سوپاسی کەسەکان نەبێت، تەنها چاکەیەك بێت کە لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورە بێت...

خوای گەورە بیسەرو بیناو دانایە، هەر ئەویش دروستکاری مرۆڤە، لەبەرئەوە هەرچاکەیەك جێبەجێی دەکەیت با بۆ دروستکاری مرۆڤ بێت، نەك بۆ مرۆڤ خۆی! من بە هۆی ئەوەی لەبەرخوای گەورە ئەو کارانەم کرد لە مردن ڕزگاری کردمو ملوانکەکەشی پێبەخشیم!

بەڕێزان ئەم چیرۆکە ئەوەمان فێر دەکات کە ئەگەر کاری باشمان کرد با چاوەڕێی پاداشت نەبین، هەر کارێك، یان خزمەتێکیش دەیکەین تەنانەت ئەگەر بێ وەفاییو پێ نەزانینمان بەرامبە کرا، واز لە کردنی ئەو کارە باشانە نەهێنینو سارد نەبینەوە، چونکە ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ڕەزامەندی خوای گەورەیە، نەك سوپاسو ستایشی خەڵکی!

هاوار هەڵشۆیی

# فرمێسکە بە ئازارەکان

لە ڕۆژێکی پرشنگداردا مامەی پیر دوای ئەوەی سوپاسی خوای کرد کە بە ڕۆژێکی نوێی شاد کردەوە، ویستی سەرێك بدات لە شەقامە قەرەباڵغەکانی شار بۆ کڕینی پێداویستییەکانی، کاتێك بە ناو شەقامەکاندا گوزەری دەکرد، هێواش هێواش هەنگاوی دەناو سەیری دەوروبەری دەکرد، سەیری کرد مرۆڤەکان هەموویان بە کاروبارەکانی خۆیانەوە سەرقاڵن، بێئەوەی کاری کەسێکیان کاریگەری هەبێت لەسەر کاری ئەوی تریان، پاشان کەمێك ڕاماو وتی: ئای! خودایە کە تۆ هەر زیندەوەرێك دروست دەکەیت ڕۆزیشی پێ دەدەیت.

مامەی پیر لەسەر ڕۆیشتنەکەی بەردەوام بوو، بینی پیاوێکی بەساڵاچوو لەسەر شەقام دانیشتووەو داوای یارمەتی لە خەڵکی دەکات، زۆر سەری سوڕماو وتی: بۆچی ئەم کابرایە بەو تەمەنەوە لەسەر شەقامە؟ لە کاتێکدا خودا ڕۆزیی دەرە، پیرەپیاو نەیتوانی خۆی ڕابگرێت، ڕۆیشت بۆ لای پیاوە بەساڵاچووەکەو پرسیاری لێکردو وتی: بۆچی لە خەڵکی دەست پان دەکەیتەوە؟

بەساڵاچووەکەش وتی: باسەکە دوورودرێژە، مامەی پیر پێداگری کرد لەسەر پێ وتنی نهێنییەکە، پاشان پیاوەکە دوای کەمێك فرمێسك ڕشتن دەرگای دڵی بۆ کردەوەو وتی: ماوەیەکی زۆر کارم کردووە، شەڕی مانو نەمانم لەگەڵ ڕۆژەسەختەکانی ژیان کردووەو شوێن نەماوە سەری لێ نەدەم، بۆئەوەی منداڵەکانم بەخێو بکەم تا لە ژیان دوانەکەون، دوای ئەوەی پێی خۆیان گرتو کەوتنە سەر ڕێڕەوی ڕەوڕەوەی ژیان، ئیدی من توانای کارکردنم نەما، ئینجا وتم: ڕۆڵەکانم سەرەی ئێوەیە بژێوی ژیان بۆ خۆتانو بۆ منیش پەیدا بکەنو من ئەو تەمەنەی ماومە دەمەوێت لە خزمەت خوادا بەسەری بەرم، بەڵام منداڵەکانم وتیان: دەبێت تا مردن کار بکەیت، ئەگەرنا ناتوانیت لەگەڵ ئێمەدا بژی، بۆیە ئێستا پیر بوومو توانای کارم نەماوەو سەر شەقامەکان شوێنی حەوانەوەمە، خێری خەڵك بژێوی ژیانمە!

مامەی پیر لە بەرامبەر ئەم تاوانە کەمێك بێدەنگ بوو، ئەویش نەیتوانی خۆی بگرێت، فرمێسك چاوەکانی تەڕکردو لە دڵی خۆیدا وتی: ئای! ویژدان کاتێك تۆ لاواز بوویت مرۆڤەکان لە ناخیاندا هەست بە هیچ ئازارێك ناکەن، پاشان وتی: دەبێت پەروەردەکردنی منداڵەکانمان بەشێوەیەك بێت لە داهاتوودا نەبن بە دڕکی سەر ڕێگەمان.

دوای کەمێك ئاخ هەڵکێشان، پیرەپیاو وتی: با بچین بۆ ماڵەوەو ئیدی لە مەودوا لەگەڵ ئێمەدا بژی، ئینجا هەردووکیان دەستیان خستە نێو دەستی یەکترو بەڵێنیان بە یەکتری دا، لە تەواوی خۆشیو ناخۆشییەکانی ژیاندا ئەو تەمەنە کەمەی ماویانە لەگەڵ یەکتری بەسەربەرنو هاریکاری یەکتری بکەن.

هێشتا هاوسەرگیریم نەکردووە

و: فیردەوس حەسەن

# هەلە لە دەستچووەکان

زەمانێك كە بۆ هاوسەرگیری گونجاوو ئامادەبووم دوو بەربەستی گەورە بوونی هەبوو، بەربەستی یەكەم خۆم دروستم كردبوو، بەربەستەكەی تریشیان باوكم، من ئەوەنــدە لە خۆبایی بـووم كە تا تەمەنی بیستو حەوت ساڵی نرخم بۆ هیچ كەس دانەدەنا، ئەگەر باسی هاوسەرگیریم لا بكرایە دەمگوت: (حاڵم بە هاوسەرگیری تێكدەچێت، حەزدەكەم ئـازادو ڕەها بم، بێ هیچ بەرپرسیاریەتییەك،حەزم لە ماڵداریو منداڵ بەخێوكردن نییە).

خوێنـدكاری بەشـی بایۆلۆجی (زیندەوەرزانی) بووم، كوڕێك بە ناوی شاروخ كە لە بەشی زەویناسی دەیخوێندو دووساڵ لە مـن گەورەتربـوو، لە ڕێگای باوكمەوە پێشنیاری هاوسەرگیری پێدام، كاتێك بینیم زۆر خـراپ لێـی تـوڕە بووم، پێـم گووت: چۆن مۆڵەتت بە خـۆت داوە كـە بیر لە هاوسەرگیری لەگەڵ مندا بكەیتەوە؟

شاروخ سوور بووەوەو وتی: بۆ مەگەر كێشەیەكی تیایە؟

بەڵێ هەمووی كێشـەیە، مـنو تۆ لە ئاستی یەكدا نیـن، من حـەز دەكەم بە لایەنـی كەمـەوە هاوسـەرگیری لەگـەڵ كەسێكدا بكەم لە كۆلێژی پزیشكی بێت.

شـاروخ سـەیرێكی كـردمو وتـی: بەداخەوەم، وام نەدەزانی ئەم مەسـەلەیە ئەوەندە بۆت گرنگ بێت.

- بۆنـا، زۆریـش گرنگـە، ئەمـە بە هەمـوو خوێندكارانـی كۆلێژەكەش بڵێ، شـاروخ ئەو كاردانەوەیـەی منی ئەوەندە پێناخۆش بوو، دوای ئـەوە ئیتر هەرگیز باسـی ئەو بابەتـەی نەكـردەوە، لەگەڵ ئەوەشـدا تا دەیتوانی لای خوێندكارەكانی كۆلێـژ لە دژی من قسـەی دەكرد، ڕۆژێك شـەهلای هاوڕێم بە تایبەتی هات بۆلامو پێی وتم:

- ئاسـیا لـە نێـوان تۆو شـاروخدا چـی ڕوویـداوە؟ وا لـە بەیانـی تائێوارە لە دژی تۆ قسـە دەكات؟ ئـەو بە هەموو خوێندكارەكانی وتووە كە تۆ كەسێكی زۆر لە خۆباییت!

زۆر پەسـت بـووم، هەرئـەو ڕۆژە لە كۆلێژ دۆزیمەوەو ڕۆیشتم بۆ لایو زۆر لێی توڕەبووم، دەنگمان لە یەكتر بەرز كردەوە، تـا كارمان گەیشـتە پاسـەوانی كۆلێژو لە كۆتایشـدا مـن مەحكوم كـرام، مەرجێكی قورسـیان بۆ دانـامو وتیـان: ئەگەر یەك جـاری تـر كەشـی زانكۆ تێـك بدەیت لە بەردەوامبوونی خوێندن بێبەش دەكرێیت.

شـاروخ هەڕەشـەی لێكردمو وتی: كە تەنانـەت ناهێڵێت ئـاوی خۆش لە گەروم بچێتە خوارێ، بەڵێنم بە خۆمدا كە ئیتر هیـچ گرنگییـەك بـە دوژمنایەتییەكانی شاروخ نەدەمو سەرگەرمی خوێندنی خۆم بـم، بـەڵام ئیتر ڕقم لە هەمـوو پیاوێك دەبووەوە. ئەگەر شارۆخ بەڕاستی مەبەستی زەماوەنـد بوایـە، نەدەبـوا بە بیسـتنی وەڵامی (نەخێر) پێشنیاری پێكەوە ژیانی بگۆڕیایە بۆ دوژمنایەتی.

كاتێـك كـە خوێندنی زانكـۆم تەواو كرد دوو داخوازیكاری باشـم هەبوو، ئەو كاتە تەمەنم ٢٤ سـاڵ بوو، دایكمو باوكم چاوەڕێبوون یەكێك لەو دوانە هەڵبژێرم، بەڵام من تاقەتی هاوسەرگیریم نەبوو.

- هیچ كامیان بە كەڵكی من نایەن.

باوكـم ڕووی ترش كـردو وتی: یانی چـی؟ مەهدی ئەندازیارەو ئەرسـەلانیش دوكانی زەڕەنگەری هەیە، هەردووكیشـیان لـە ڕووی كەسـایەتیو ڕەوشـتەوە كوڕی باشـن، بۆچی عەیبو عار لە كوڕی خەڵك دەگریت؟

- حەز بە قەدوباڵایان ناكەم، مەهدی كەچەڵـەو ئەرسـەلانیش هاوشـانی خۆم نییە.

دایكـم گازی لـە لێـوی گـرتو: خوا بمكـوژێ، مەگەر مـنو باوكت هاوشـانی یەكترینو بەدبەخت بووین تا تۆ ببیت؟

- دەی بۆچوونو سەلیقەی من لەگەڵ ئێوەدا جیاوازە.

باوكـمو دایكم نەیانتوانـی من ڕازی بكەن، تەنانەت خوشـكە گەورەكەشم زۆر هەوڵـی دا ڕازیم بكات كە هاوسـەرگیری بكـەم، بـەڵام نەیتوانی، لـەوەی كە هیچ نرخێكم بـۆ خوازبێنیكارەكانم دانەدەنا، هەسـتم بـە خۆشـی دەكـرد، مەهـدی چەندجارێك تەلەفۆنـی بۆكردمو ڕۆژێك خەجاڵەتی وەلاناو وتی:

- ئاسیا خانم بیستوومە لەبەرئەوە منت ڕەت كردووەتەوە كە سـەرم ڕووتاوەتەوە، دەی خۆ ئەوە گرنگ نییە، من بە چاندنی موو ئەو كێشەیە چارەسەر دەكەم.

دیسـان وەڵامی نەخێرم پێـداو وتم: جـارێ دەمەوێـت لـە فەرمانگەیـەك دامەزرێـمو كار بكەم، كاتی ئـەوەم نییە بیر لە هاوسەرگیری بكەمەوە.

وازی نەدەهێنـا، لـەوەی كـە شـێتی من ببـوو، ئامادەبوو بۆ گەیشـتن بە من هەركارێك پێویسـت بێت ئەنجامی بدات،

بەلام من زیاتر لە خۆبایی دەبووم، ئەوەندە کاردانەوەم خراپ بوو لەگەلیدا تا بۆ هەمیشە وازی هێنا.

هەر بەو شێوەیەی کە وتم ئەو بەربەستەی کە خۆم دروستم کردبوو تا تەمەنی بیستو حەوت سالی بەردەوام بوو، بەلام لەم کاتەدا کوڕێکی دیکە بە ناوی نیما پێشنیاری هاوسەرگیری خستە بەردەمم، لە دەرەوەی ولات خوێندنی تەواو کردبوو، ئەندازیاری میکانیك بوو، لە خانەوادەیەکی دەولەمەندیش بوو، ڕەفتارو قەدوبالایم بە دل بوو، بە کورتی کەموکورتی نەبوو، سارای هاوکارم ئەوی پێناساندم، نیما لەبەرئەوەی لە بەریتانیا خوێندبووی، زۆر ڕێزی لە دابو نەریتی ئێمە دەگرت، هەر لەبەرئەوەش بە دایکی وت کە تەلەفۆن بۆ دایکم بکاتو کاتی خوازبێنی دیاری بکەن، دایکمو باوکم پێشوازیان لەم خوازبێنییە کرد، بەلام بەربەستی دووەم لێرەدا دەرکەوت، کە باوکم دروستی کردبوو، لە دانیشتنی خوازبێنییەکەدا کە باس هاتە سەر مارەیی، باوکم وتی:

- مارەیی کچەکەم هەزار لیرەیە.

باوکی نیما بەزەردەخەنەیەکەوە وتی: مارەیی نابێتە هۆکاری خۆشبەختی ژنو مێرد.

دایکی نیما وتی: ئاخر کێ مارەیی داوەو کێ وەریگرتووە؟

باوکیشم زۆر بە جدییەوە وتی: بەلام کچی من وەری دەگرێت، هەردوای ئەوەی مارە کرا، دەبێت هەموو مارەییەکەی ئامادە بێت.

باوکی نیما کە ئیتر زەردەخەنە لەسەر لێوی نەبوو پرسی: ئەو هەموو سەختگیرییە بۆچییە؟

باوکم بەڕووخسارێکی ساردو وشکەوە وەلامی دایەوەو وتی: مەگەر نابینن ئاماری تەلاق چەندە بەرزبووەتەوە؟ ئەگەر پیاو بزانێت چەندی لە خێزانەکەیدا خەرج کردووە باشتر ڕێزی دەگرێتو لەگەل یەکەم دەنگە دەنگو نەگونجاندا باس لە تەلاقو جیابوونەوە ناکات.

نیما کە سووربووەوەو ئارەق لە ناوچەوانییەوە دەهاتە خوارێ، وتی: من لەو جۆرە کەسانە نیم، من دوای ناسینی تەواوو لێکۆلینەوەیەکی زۆر ئاسیا خانمم هەلبژاردووە، لەبەرئەوە دلنیابن کە...

باوکم زۆر بەساردی وتی: من بە قسە دلنیا نابم، ئەگەر ڕاست دەکەیت مارەییەکەی بۆ ئامادە بکە.

من کە زۆر لەو کاردانەوەیەی باوکم توڕە ببووم، دەمم کردەوە کە قسە بکەم، بەلام دایکم بە ئیشارەت پێی وتم کە بێدەنگ بم، ئەو ڕۆژە دانیشتنی خوازبێنییەکە بێ هیچ ئەنجامێك کۆتایی هات.. دوای ڕۆیشتنی نیماو خانەوادەکەی باوکم وتی:

- ئاسیا گیان من خەمی ئایندەی تۆمە. هەزار لیرە بۆ ئەم خانەوادەیە یانی هیچ. کەواتە ئەگەر بەڕاستی تۆیان بووێت بە پێشنیارەکەمان ڕازی دەبن.

ڕۆژی دواتر نیما تەلەفۆنی بۆ کردمو دوای گلەییەکی زۆر وتی: باوکت هەموو شتێکی تێکدا، من نازانم ئەمە مەجلیسی خوازبێنی بوو، یان کڕینو فرۆشتن؟

مافم بە ئەوداو وتم: ڕاست دەکەیت، بەلام باوکم ئەوەندە ژیانی ئەمو ئەوی دیوە، یان بیستویەتی کە بە تەلاق گەیشتووە، ئیتر ترساوە...

نازانم، بەلام بۆ دەبێت گوناهی هەمووان لەسەر شانی من بێت؟ خۆت باش دەزانی کە من دەتوانم ئەم مارەییە دابین بکەم، بەلام باوکم دەلێت خانەوادەی ئێوە زۆر پارە خۆشەویستنو لەبەرئەوەش ڕازی نییە، تووخوا تۆ کەمێك لە مەرجەکەی باوکت کەم بکەرەوە!

نیماو خانەوادەکەی ڕاستیان دەکرد، بەلام باوکم ئامادە نەبوو لە مەرجەکەی بێتە خوارێ، نیما دووسال چاوەڕێی کردو پاشان لەگەل کچێکی تر کە وابزانم زۆر لە من باشتر بوو، هاوسەرگیری کرد، لەوەی کە ئەوم لە دەست دابوو، زۆر ناڕەحەت بوومو هەمیشە باوکمم سەرزەنشت دەکرد، تا چوار سال نە داخوازیکارێکی گونجاوم هەبوو، نە خۆشم پێشوازیم لە هیچ داخوازیکارێك دەکرد، دواجار دکتورێکی ددان هاتە خوازبێنیم، کوڕێکی باش بوو، مەبەستی ئەو هاوسەرگیری بوو، هەر بۆیە لەگەل خانەوادەکەی هاتن بۆ مالمان، باوکم سەیرێکی کردمو وتی: بینیت داخوازیکاری باشتر لە نیماش هەیە؟ تۆ وات دەزانی دنیا بە بنبەست گەیشتووە، ئێستا دەبینی کە ئەم کاکی دکتۆرە بە مەرجەکەمان ڕازی دەبێت.

بە نیگەرانییەوە وتم: بابە توخوا ئەمجارە کارێك مەکە مەجلیسەکە تێکبچێت، باوکم بێدەنگ بوو، بەلام بە ڕووخساریدا تێگەیشتم کە دەیەوێت کاری خۆی بکات، ئەو شەوە باوکم جگە لەوەی داوای هەزار لیرەی کرد، داوای ئەوەشی کرد کە شوقەیەکم بۆ بکرێت، سیامەك ڕازی بوو، بەلام خانەوادەکەی ناڕازی بوونو وتیان: ئەم کارە سووکایەتی کردنە بە ئێمە، مەگەر چیتان لە کوڕەکەی ئێمە دیوە وا دەتانەوێت ئەو هەموو پێداگرییە بکەن؟

باوکم بە توڕەییەوە وتی: ئەگەر ئێوە مەبەستێکتان نییەو ناتانەوێت دوای چەند مانگێك کچەکەم تەلاق بدەن، ئەی بۆچی ئەوەندە ناڕەحەت بوون؟

بەمجۆرە بەردەوام بوون تا مەجلیسی خوازبێنییەکە تێکچوو...

دوای ئەو چەند داخوازیکارێکی تریشم هەبوو، کە یان پێیان ڕازی نەدەبووم، یان دووبارە باوکم بە سەختگیرییە بێ بنەماکانی ڕاوی دەنان، تا ئەوەی کە تەمەنی سی و پێنج سالیشم تێپەڕاند.

ئێوە باش دەزانن کە کچ دوای ئەم تەمەنە داخوازیکارێکی وای نابێت، هەر لەبەرئەوەش زۆر بێتاقەت بووم!

- بۆچی لە هەموو کەس دووردەکەویتەوە ئاسیا؟ دایکم هەموو ڕۆژێك ئەمەی لێ دەپرسیمو دەیگوت: حەزناکەم بەو شێوەیە بتبینم.

ڕاستییەکەی ئەوەبوو کاتێك کە کچێکم لە جلی بووکێنیدا دەبینی، ئەوەندە دەکەوتمە بیری ڕابردوومو هەلە لەدەستچووەکانم تا توشی تا دەبووم، ئەم بارودۆخەم تا ئێستاش بەردەوامەو هیچ ئومێدێکم بە هاوسەرگیری، یان باشترە بلێم هاوسەرگیرییەکی گونجاو نییە.

**بیروڕای دەروونناسان لەسەر ئەم بابەتە:**

کەسێك کە هەلە باشەکانی هاوسەرگیری لەبەر لە خۆبایی بوون، یان سەختگیرییە بێ بنەماکان لە دەست دەدات، دیارە دووچاری پەشیمانی دەبێتەوەو خۆزگە بە ڕابردوو دەخوازێت، ئاسیا هەر بەو شێوەیەی کە خۆی باسی کردووە لە قۆناغێکدا خۆی بەربەستی لە بەرامبەر داخوازیکارەکانیدا داناوەو لە قۆناغێکی تریشدا باوکی بەربەست بووە، هەرلەبەرئەوە هەلەکان یەك لە دوای یەك لە دەستچوون، لە کاتێکدا ئاسیاوخانەوادەکەی دەیانتوانی بەشێوەیەکی ژیرانە مامەلە بکەنو بە ئەنجامێکی باش بگەن، لەگەل ئەوەشدا ئەو دەبێت ڕابردوو فەرامۆش بکاتو لە جیاتی خەفەت خواردنو گۆشەگیری بچێتەوە ناو کۆمەلگاو هەلە نوێیەکان لە دەست نەدات.

دوای تەڵاق

# چەند پێشنیارێك بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی تەڵاق

بۆئەوەی ڕێژەی تەڵاق لە نێو هاوسەراندا بە گشتیو هاوسەرانی نوێدا بەتایبەتی تا ڕادەیەك ڕوو لە کەمی بکات، پێویستە چەند خاڵێك ڕەچاو بکەین، کە هەندێکیان پەیوەستن بە خودی هاوسەرەکانەوە، هەندێکی دیکەشیان ئەرکی دایكو باوکی کچو کوڕەو هەندێکی دیکەش دەکەوێتە ئەستۆی حکومەت.

دیارە خاڵەکان زۆرن، بەڵام ئێمە بۆ هەر یەکێکیان تەنها ئاماژە بۆ سێ خاڵ دەکەین.

**ئەو خاڵانەی پەیوەستن بە کوڕو کچەوە:**

١- ئەم دوو کەسە بەڕێزە بۆئەوەی لە وشەی تەڵاق دوور بکەونەوە، دەبێت سەرەتا زۆر بە ژیریو وردەکارییەوە کاربکەن تا بزانن کێ دەکەنە هاوسەری ژیانیانو لەگەڵ کێدا لە ژێر ساباتی ماڵێکی خنجیلانەدا کۆدەبنەوە. گەر بە چاوی عیشق بڕوانی ئەوا هیچ هەڵەیەك لە بەرامبەرەکەتدا نابینی، بەڵام گەر بەچاوی ژیری بڕوانی بۆ بەرامبەر، دڵنیابە دەتوانیت کەسی باشو خراپ لە یەکتر جیا بکەیتەوە. ئەو کات دەزانیت کێ شیاوی ئەوەیە پرۆسەی هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجام بدەیت.

٢- نابێت هاوسەران لەبەر جوانی و پارەو سامانو خانوو ئۆتۆمبێل یەکتری قبوڵ بکەن، دڵنیابە ئەگەر کەسێك لەبەر جوانییەکەت هەڵیبژاردی، ڕۆژێك دادێت کەسێك دەبینێت لە تۆ جوانترەو جوانی تۆی لەبەرچاو دەکەوێت، ئەگەر لەبەر پارەو سامانەکەت تۆی هەڵبژارد، کەسێك هەیە لە تۆ دەوڵەمەندترو ساماندار تر، هەموو ئەمانەش تا سەر موڵکی کەس نین، واتە سەروەتو سامانو جوانی ڕووخسار، شیاوی نەمانو لەناوچوونە، بەڵام ئەگەر کەسێك لەبەر دینو ئاکارو ڕەوشتو ژیریت هەڵی بژاردیت، بێگومان خۆشبەختو ئاسوودە دەبیت! چونکە ئەوانە هۆکارێکن نە گۆڕانیان بەسەردادێو نە لەناودەچن.

٣- نابێت ژیانی هاوسەری وەکو خەونو خەیاڵ وێنا بکەیت، وابزانیت هەموو ساتو ڕۆژەکانی ژیانتان پڕە لە خۆشیو بەختەوەری، ڕەنگە هەندێجار هاوسەران دووچاری دەمەقاڵەو ناخۆشی ببنەوە، پێویستە لە کاتی ناخۆشیدا ئارام بگرن، چونکە هەموو ساتێك شەڕو ئاژاوە نییە! ئەگەر هاوسەرەکەت ڕۆژێك خراپە، یان ئاکارێکی ناشیرینی لەگەڵدا نواندوویت، بە سەدان ڕۆژ چاکەی لەگەڵدا کردوویت!

**ئەو خاڵانەی پەیوەستن بە باوکانو دایکانەوە:**

١- سەرپەرشتیاری یەکەمو لێپرسراوی یەکەم بەرامبەر بە ئایندەی منداڵەکان دایكو باوکە، هەربۆیە پێویستە سەرەتا تەمەنێکی گونجاو بۆ هاوسەرگیری کوڕو کچەکان هەڵبژێرن، چونکە تەمەن یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی سەرکەوتنی بواری پرۆسەی هاوسەرگیری، بە ڕای پسپۆڕانی پزیشکیو دەروونی باشترین تەمەن بۆ چوونە نێو ژیانی هاوسەرییەوە تەمەنی سەرو بیستساڵییە بە نیسبەت کچانەوە، بۆ کوڕانیش سەرو بیستو پێنج ساڵییە!

٢- پێش ئەوەی کوڕو کچەکان بگەنە تەمەنی هاوسەرگیری، پێویستە سەبارەت بەو پرۆسەیە سەرنجو تێبینیو پەروەردەیەکی گونجاو ڕاشکاوانە بکرێن، بە تایبەت سەبارەت بە پێکەوە ژیانو ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتییەکانی ژیانی هاوسەری.

٣- هەر کات کەسێکی خاوەن ڕەوشتو ئاکارو دیندار هات بۆ خوازبێنی کیژەکەت، ئەوا بیانووی پێ مەگرەو مەرجی قورسو سەختی بۆ دامەنێ، بەڵکو ڕێوڕەسمو کارەکانی بۆ ئاسان بکە، چونکە ئەم جۆرە کەسانە دەتوانن درێژە بە ژیانی هاوسەرداری بدەنو بەسەر گرفتو کێشەکانی نێوانیاندا زاڵ ببن.

**ئەو خاڵانەی پەیوەستن بە حکومەتەوە:**

١- لە وڵاتی کووەیت دوای ئەوەی زانرا ڕێژەی تەڵاق بە ڕێژەیەکی بەرچاو زیادی کردووە، شارەزایانو خەمخۆرانی ئەو وڵاتە چەند پێشنیارێکیان کرد بۆ کەمکردنەوەی ئەم دیاردەیە، یەك لەو پێشنیارانە ئەوەبوو کە دەبێت هەر کوڕو کچێك پێش ئەوەی بچنە نێو ژیانی هاوسەرگیرییەوە دەبێت خولێك سەبارەت بەو دیاردەیە ببینێت، واتە کوڕان خولێك دەبینن تا فێریان بکەن ژیانی هاوسەریو ماناو مەبەست لێیو ڕێزگرتنو وەفاداریو مامەڵەو هەڵسوکەوتو... چەندین شتی دیکە لە وانەکانی ئەو خولەدا دەخوێنرێت، بە هەمان شێوەش کچان لە خوولەکەدا هەموو ئەو ئەرکو مافو شێوازی ژیانی هاوسەریو مامەڵەکردن لەگەڵ هاوسەرو کەسوکاریو .... هتد، فێر دەبن، ئەمەش بە ڕێژەیەکی بەرچاو ڕێژەی تەڵاقی لەو وڵاتەدا تا ئاستێکی باش دابەزاندووە.

کەواتە دەکرێت هەروەکو چۆن لە هەرێمی کوردستان هەر کەس بیەوێت مۆڵەتی شۆفێری دەربهێنێت، سەرەتا پێویستە لە نووسینگەی فێربوونی شۆفێری چەند ڕۆژێك کە لانی کەم دوو هەفتەیە وانەی تیۆری دەخوێنێت، هەرواش دەکرێت وەزارەتی داد خوولی لەو شێوازە بکاتەوە بۆ ئەوانەی دەیانەوێت ژیانی هاوسەری پێك بهێنن، بەو هیوایەی ڕۆڵی بەرچاوی هەبێت لە کەمکردنەوەی ئەو دیاردەیەدا.

٢- بەشێوازێکی دیکە دەکرێت وەکو وانەیەك بکرێتە پرۆگرام لە پەیمانگاکانو زانکۆکان بکرێتە وانەیەکی فەرمیو خوێندکاران بە شێوازێکی ئەکادیمیانە بە ژیانی هاوسەریو هەڵبژاردنی هاوسەرو مامەڵەی ژیانی هاوسەریو... هتد، فێر بکرێن.. وانەکەش لە لایەن کەسانی پسپۆڕو بە ئەزموونەوە بگووترێتەوە، نەك وەکو وانەیەکی لاوەکی سەیر بکرێت.

٣- ئەرکی سەرشانی حکومەتە یەکەی نیشتەجێبوون بەبێ هیچ پێشەکییەكو تەنها بە قیستی مانگانە کە لەگەڵ داهاتی خێزانەکاندا بگونجێت، بۆ هەموو ئەو کەسانە دابین بکات کە دەچنە ژیانی هاوسەرییەوە، چونکە نەبوونی شوێنی نیشتەجێبوون بە یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی جیابوونەوە دادەنرێت.

# چۆن زەردەخەنە وێنا بکەین؟



ئا: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

کچێکی بچکۆلانە کە تەمەنی لە شەش ساڵان تێپەڕی نەدەکرد، پاکەتە کلێنێکسی لەسەر شەقامەکان دەفرۆشت، بەسەر دەستە بچووکەکانییەوە پاکەتی کلێنێکسی بەناو فرۆشیارەکاندا دەگێڕا.

لەو کاتەدا چاوی بە ئافرەتێك کەوت هۆن هۆن ئەسرین لە چاوەکانی دەباری، چەند چرکەیەك بەڕامانەوە لە بەردەمیدا وەستا، ئافرەتەکە بە چاوە فرمێسکاوییەکانییەوە چاوی بەرەو کچە بچکۆلانەکە هەڵبڕی، کچە بچکۆلانەکەش بە زەردەخەنەیەك کە لە قوڵایی دڵە پاکەکەیەوە هەڵقوڵابوو، کلێنێکسێکی دا بە ئافرەتەکەو بە جێیهێشت، پێش ئەوەی ئافرەتەکە بتوانێت نرخی کلێنێکسەکەی بداتێ، پاش ڕۆیشتنی چەند هەنگاوێك، ڕووی بەرەو ئافرەتەکە وەرگێڕاو بەدەستە بچکۆلانەکانی ئاماژەی بۆ ئافرەتەکە کرد، کە هەتا ئەو کاتەش زەردەخەنەکان ڕووی بە جێنەهێشتبوو.

دوای ئەوە ئافرەتەکە کەوتە بیر کردنەوە، پاشان مۆبایلەکەی دەرهێناو نامەیەکی نووسی: (داوای لێبووردنت لێدەکەم... تۆ خاوەن حەقی!)، نامەکەی نارد!

کاتێك نامەکە بە دەستی هاوسەرەکەی گەیشت، کە لە چێشتخانەیەك بە دڵتەنگیو خەمبارییەوە دانیشتبوو!!!

دوای ئەوەی نامەکەی خوێندەوە، زەردەخەنەیەکی کرد، هەستا (٥٠) جونەیهی دا بە شاگردەکە، لەگەڵ ئەوەی پارەکەی تەنها (٥) جونەیهی دەکرد!!!

لەو کاتەدا شاگردەکە زۆر دڵخۆشبوو، بەو دەستکەوتو ڕۆزییەی کە بە هیچ شێوەیەك چاوەڕوانی نەدەکرد، بۆیە لە چێشتخانەکە چووە دەرەوە، بەرەو ڕووی ئەو ئافرەتە ڕۆیشت کە لەسەر شەقامەکە دانیشتبوو، شیرینی دەفرۆشت، بایی (١) جونەیهی شیرینی لێکڕیو (٢٠) جونەیهی وەکو هاوکاری بۆ دانا، بە خەندەوە بەجێیهێشت!!

چاوەکانی پیرەژنە شیرینی فرۆشەکە بە بینینی (٢٠) جونەیهییەکان وشك بووبوون، بۆیە بە دەموچاوێکی گەشو دڵێکی پڕ لە خۆشحاڵییەوە هەستایە سەرپێ، دەستیکرد بە پێچانەوەی شیرینیە سادەکەی، چوو بۆ لای گۆشت فرۆشێك بۆ ئەوەی پارچە گۆشتێکی لێبکڕێتو بگەڕێتەوە بۆماڵەوە خواردنێکی بەتام بۆ کچەزاکەی ئامادە بکات، چاوەڕوانی هاتنەوەی بێت، چونکە ئەوەی لە ژیانیدا هەیبێت تەنها ئەو کچەزایەیەتی، بۆیە خواردنی بۆ ئامادەکردو هەمان ئەو زەردەخەنەی لەسەر ڕووی بوو کە بووە هۆی پەیداکردنی گۆشت بۆ خواردنی... پاش چەند خولەکێك دەرگاکە کرایەوە، کچە کلێنس فرۆشە بچکۆلانەکە وەژوور کەوت، بە دەموچاوێکی گەشو زەردەخەنەیەکی جوانی... منداڵانەی بێگەرد، دەموچاوی ڕووناك کردەوە!!!

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) دەفەرمووێت: (زەردەخەنەیەك بەڕووی براکەتدا چاکەیە).

ڕاتان چییە هەر یەك لە ئێمەش ئەو منداڵە چی کرد، ئێمەش وەها بکەین؟

چی دەبێت ئەگەر هەریەك لە ئێمە وێنای زەردەخەنە لە دڵەکانمان بخەینە سەر ڕووی خەمباران؟

ئەگەر بمانەوێت وێنای زەردەخەنە بکەین بە قسەیەکی باش؟

هەوڵ بدەین بە سڕینەوەی فرمێسکی هەڵوەریوو لە دڵێکی پڕ لە ئازار!

بە خێرێکی کەم بۆ خاوەن پێداویستە نەدارەکان، کە توانای کڕینی نانێکیان نییە!

بە کڕینی دیارییەك بۆ نەخۆشێك کە لەبەر نەخۆشی توانای هاتنە دەرەوەی نییە!

بە تەلەفۆن کردنێك بۆ هەواڵ پرسینی خزمو کەسە نزیکەکانت!

بەدەستهێنان بەسەری هەتیوێك، کە وەکو بێچووە باڵندەیەك خۆی دەبینێت لەبەردەم ڕەشەبادا!

ڕێگاو شێوازی زۆر هەیە کە ناتوانین دەستنیشانیان بکەینو بیانژمێرین، کە دەتوانین لە ڕێگایانەوە وێنای زەردەخەنە بکەین لەسەر ڕووی خەڵکانی تردا...

تەنها بە بیرکردنەوە لەو هەموو بەخششە گەورانەی کە خوای گەورە پێی بە خشیووین..

تەنها بەوەی کە نارەزایی بوونی خۆمان دەرنەبڕین لەو هەموو شانسەی بەسەرماندا تێپەڕیووە..

ئەگەر زەردەخەنەت خستە سەر ڕووخسارت، ئەوسا کە هەموو دنیا بە ڕووناکی دەبینیت!!

شێخانی





# خۆشەویستان چاوەڕوانی چی دەکەن؟

لە زۆر دیدارو دانیشتنو سەردانی دۆستانو خۆشەویستاندا چاوم بە زۆرێك لە خوێندکارانو ڕۆشنبیرانی گەنجو لاو دەکەوێتو لە ناخەوە حەزو ئارەزووی خۆیان بۆ نووسینو بەشداریکردن لە گۆڤاری بڕیاردا دەردەبڕنو هاوکات بە شەرمەوە دەپرسن: ئاخۆ ئەگەر شتێك بنووسنو بۆ بڕیاری بنێرن بۆیان بڵاو دەکرێتەوە؟

سەرەتا من زۆرخۆشحاڵم بەو هەستەی کە لە دڵی ئێوەی ئازیزدا دروستبووەو بە هەنگاوێکی گرنگو وەرچەرخانێکی باشی دەزانم، هەڵبەت ئەو کەسانەی بیر لە نووسین دەکەنەوە، هەست بە بوونی تواناو بەهرەیەك لە خودی خۆیاندا دەکەنو سەرەتایەکی باشە بۆ خۆناسینو ئاشنا بوون بە خوود.

ئەوان دوای خوێندنەوەی بابەتە ڕەنگاوڕەنگەکانی بڕیار گەیشتنە ئەوەی کە حەز دەکەن ئەوانیش هەستی جووانو پەیڤی ناسکی خۆیان بە زمانی شیرینی کوردی پێشکەش بە هاوزمانانی خۆیان بکەن، بەڵام وێڕای ئەو حەزو ئارەزووە دودڵنو چاودەگێڕن کەسێك دەستیان بگرێتو ڕێنماییان بکات.

بە داخەوە سیستەمی خوێندن لە وڵاتی ئێمەدا لە کۆنەوەو تا ئێستاش دەقی بە شێوازی تەڵقین کردنەوە گرتووەو قوتابی تا دەگاتە زانکۆش لەسەر خوێندنەوەو موتاڵاو نووسینو دەربڕینو گوزارشکردن لە هەستی ناخو بیرۆکەی جوانو تەعبیری ئەدەبی ڕاناهێنرێن، لە کاتێکدا میللەتی کورد لە دێر زەمانەوە بە گەلێکی هەستیارو زیرەكو خاوەن خامە ناسراوەو هەر لە کۆنەوە جێگەی سەرنجی ڕۆژهەڵاتناسانو مێژوونووسان بووە، بەڕادەیەك وەختێك هاتوونەتە نێوکۆمەڵگەی کوردەوارییەوە کە ئەو کات زۆربەی زۆری خەڵك بە مەڕداریو ئاژەڵدارییەوە خەریکبوون گوتوویانە: کورد، یان شوانن، یان شاعیرن!

هەبوونی کەلەپوورێکی دەوڵەمەند بە بەستەو مەقامو شیعرو داستانو هەڵکەوتنی کەڵەشاعیری وەکو نالیو سالمو کوردیو مەحویو گۆرانو هێمنو هەردیو قانعو بێکەسو چەندین نووسەری بلیمەتی تر، گەواهیدەریی ئەو ڕاستییەن!

بەو ئازیزانەش دەڵێم: چیدی چاوەڕێ مەبنو دەستی هیمەت بدەنە خامەی ڕەنگینی خۆتانو مافی بڵاوکردنەوەشی خۆتان دەیبەخشن بە نووسینەکانتان، هەر نووسینێك لە ئاستی بڵاوکردنەوەدا بێت، خۆی ڕێگەی بڵاوبوونەوە دەگرێتەبەر.

کەس لە پڕێك نەبووە بە کوڕێك، بە هەوڵدانو کۆڵنەدان دەگەینە ئامانج، ئێمەش وەکو بڕیار ئامادەی هەموو هاوکارییەکتانینو سوپاس بۆ خودا هەندێك لەو ئازیزانە ئێستا لە نووسەرانی بڕیارنو ئەو بەربەستەیان شکاند، هەر داواکاریو پرسیارێکیشتان هەیە، دەتوانن بەم ئیمەیڵە پەیوەندی بکەن:

(shexany@bryarmagazine.com)